یەکەمین گۆڤاری کارگێڕی و گەشەپێدانی مرۆیی
لە کوردستاندا
40
لە پێناو گەلێکی خاوەن بڕیاردا

# بڕیار



مانگانەیەکی تایبەتە بە کارگێڕی و گەشەپێدانی مرۆیی
ساڵی چوارەم ئەیلولی - ٢٠١١

## با سەر لە نوێ دەست پێبکەین!

یادگارییە دووبارەکان

مەحموودی موعەززەمی، بۆ بڕیار دەدوێت..

خەزێنەی خوێندنەوە

پەیوەندیو متمانە لای منداڵ

گەڕانەوە بۆقوتابخانە..
گەڕانەوە بۆ ئاینده

ئەدەبی کوردی



بابە گیان

هەستێک بۆ ئێوە

The first Magazine Specialized in Management and Human Development in Kurdistan

لە پێناو گەلێکی خاوەن بڕیاردا

بڕیار

مانگانەیەکی تایبەتە بە کارگێڕی و گەشەپێدانی مرۆیی

ساڵی چوارەم - ژمارە 40 - ئەیلولی 2011

**خاوەنی ئیمتیاز**

ئەندازیار: مەسعود تاهیر ڕۆژبەیانی

**سەرنووسەر**

عادل محەممەد شێخانی
sarnosar@bryarmagazine.com

**بەڕێوەبەری نووسین**

بەرزان ئەبوبەکر

**دەستەی نووسەران**

هاژە شێروانی
بێگەرد فارس
وەهاب حەسیب
پەری شێخ کەریم
محەممەد مێرگەیی
ئەسکەندەر ڕەحیم
محمد هاشم محمد

**بەشی هونەری و دیزاین**

قەیدار ڕەحیم

**ڕاوێژکاری یاسایی**

پارێزەر: ئازاد محێدین

**بەشی ڕیکلام**

07480112787

چاپ: کۆمپانیای پیرەمێرد

نرخ 2500 دینار

Www.bryarmagazine.com



























**ناونیشانی گۆڤار**

سلێمانی - شەقامی سالم -تەلاری جەمالی حاجی عەلی- نهۆمی سێیەم

نزیك پردی خەسرەو خاڵ

٣١٩٣٩٤٦ - ٠٧٧٠٢١٧٨٦٨٢

هەولێر ٠٧٥٠٤٤٦٣٢٣٠

E-mail: bryar@bryarmagazine.com

دابەشکردن: کۆمپانیای پەیك

٣٢٠٤٠٩٦ - ٠٧٧٠٨٦٤٩٢١٠



# گەڕانەوە بۆ قوتابخانە.. گەڕانەوە بۆ ئاییندە

چەند خۆشبوو ڕۆژانێك کە ساڵێکی نوێی خوێندن دەستی پێدەکرد، بە هەستێکی نوێو گوڕوتینێکی نوێوە، بەرەو قوتابخانە دەکەوتینە ڕێو هەمووومان ئەو هەڵبەستەمان هەر لە یادە کە دەمانگوت:

براکانم خوشکەکانم
هاوڕێ خۆشەویستەکانم
دەرگای مەکتەب کرایەوە
پشووی هاوین بڕایەوە
جا نۆرەی قوتابخانەیە
کە بۆ زانین هێلانەیە
بە یەکتر شاد دەبینەوە
ڕێگای زانست دەگرینەوە

هەمووومان لە یەك ڕۆژی دیاریکراودا، دەچووینەوە نێو هۆڵەکانی خوێندن، کێ دەیتوانی دوابکەوێت!

بەڵام ئێستا ڕووداوی کردنەوەی دەرگای قوتابخانەو خوێندنگەو تا زانکۆو پەیمانگاکانیش، زۆر بە بێدەنگیو سادەیی ڕادەبورێو بە چەندین ڕۆژ دوای دیاریکردنی وادەی دەستپێکردنی خوێندنیش سیستەمی دەوام ڕێكو پێك نابێت!

دەبوا ئێمە ئێستاو لە زەمانێکدا کە زانستو ماریفەت گەورەترین چەکی دەستی میللەتانە، گەورەترین گرنگیمان بە پرۆسەی خوێندنو پەروەردەو فێرکردن بدایەو لە پێشەوەی هەموو کارەکان دامانبنایە!

دەبوایە ڕۆژی واڵاکردنی دەرگای قوتابخانەو خوێندنگاکان خۆشترین ڕۆژی نەتەوەیی بووایەو گەورەترین ئاهەنگی تێدا بگێڕدرایە، تا نەوەکانمان بزانن ئێمە چەندە یاری خوێندنو زانستین!

دەبوا بەشێکی زۆری بودجەی حکومەت بۆ پەرەپێدانی ئەم پرۆسەیە تەرخانکراباو گەورەترین پشکی لە پلانو پڕۆژەی نوێ پێببەخشرایە!

دیارترین سیمای شارستانیش گرنگیدانە بە پەروەردەو فێرکردنو سوودوەرگرتن لە سەرچاوەی مرۆیی!

کە بەداخەوە ئێمە کەمترین سوودمان لە گەورەترینو بە نرخترین سەرچاوە کردووە، کە عەقڵو تواناو بەهرەی مرۆڤەکانە!

بەڵام ئێمە بەداخەوە وەکو مرۆڤانی چاخی کۆن تەنها هێزو دەسەڵاتو وزەی خۆمان لە پارەو پولو سامانە مادییەکاندا دەبینینەوە، لە بیرمان چووە کە سەروەتو سامانو دەوڵەمەندی، زێدەی ژیریو بەهرەمەندیو شارەزایی مرۆڤە، بەڵام هەرگیز بە پارەو پول، ناتوانین هزری بەرزو ژیریو تێگەیشتنو بیری تیژو پەروەردەی بڵند بکڕین!

گرنگیدانمان بە نەوەکانمانو دابینکردنی باشترین سیستەمی خوێندنو پڕۆگرامی نوێ، دابینکردنی ئایندەی ئەم وڵاتەو پیاوانی دوارۆژی ئەم وڵاتەیە!

هیوادارم ئەو ڕۆژە ببینین، کە سیستەمی خوێندنی وڵاتی مەش، وێڕای شوێنو یەکەو بەشەکانی خوێندن، لە وڵاتانی پێشکەوتووش لە پێشتر بێتو نەوەکانمان جارێکی تر شێتو شەیداو عاشقی خوێندن بنو نەوەیەکی داهێنەرو بەرهەمهێنو کارا بێتە بەرهەم!

ئەو کاتەش دەتوانین، پێوانەی مەودای گەشەپێدانو پێشکەوتنی وڵاتەکەمان بزانین کە تەنها خوێندنو زانستو پێشکەوتنی تەکنەلۆژی، هاوڕێ بە پەروەردەی دروستو نیشتمانپەروەرو یاسادۆستو شارستانی دەکەینە پێوەری گەشەسەندنو پێشکەوتنو هەموو ساڵێکی نوێی خوێندنیش لەگەڵ نەوەکانماندا منداڵ دەبینەوەو دەچینەوە سەر تەختەی قوتابخانەو یادگارییە خۆشەکانی زەمانی منداڵیمان دێتەوە یاد!

ساڵی نوێتان پیرۆزو سەرکەوتنو پێشکەوتن، یارو یاوەرتان بێت!

# کارگێڕی بە گوفتار

من لە خودی خۆم ڕازی نیم،
ئیدی بۆچی بە باسی خراپەی خەڵکەوە سەرقاڵبم !
ڕەبیعی کوڕی خوسەیم

خەمو خەفەت، نیوەی پیرییە !
ئیمامی عەلی

نیشتمانپەروەری، خزمەتو قوربانییە،
نەك قسەی کلۆرو وتاری ڕازاوە !
پەندێکی عەرەبی

ئەو زەمانەی یاری پێدەکەین، یاریمان پێدەکات !
لیوناردو دافینشی

چ تاوانێك گەورەترە، لە بەفیڕۆدانی کات !
پەندێکی ئینگلیزی

شکست مانای ئەوە نییە تۆ دۆڕاوی،
بەڵکو مانای ئەوەیە کە تۆ هێشتا سەرنەکەوتوویت !
مالکوم فوربس



# با سەر لە نوێ دەست پێبکەین!

(برنالدهالدین) لە کتێبی (چۆن سەرکەوتن دەکەیت بە نەریت؟)دا بەسەرهاتی پیاوێك دەگێڕێتەوە کە تەمەنی چلو سێ سالی تێپەڕاندووەو هاتووەتە لای‌و دەلێت:

(یاسام خوێندو ئەمڕۆ پارێزەرم، بەلام دوای تێپەڕبوونی پانزە سال بەسەر کارەکەمدا، وا هەست دەکەم، کە من نەمتوانیوە ئەو سەرکەوتنە بە دەستبهێنم، کە ئەو کاتە دەمویست کە خوێندکاری کۆلێژی یاسا بووم‌و هێشتا خوێندنم تەواو نەکردبوو)!

هالدین دەلێت: بە پیاوەکەم گوت: بگەڕێوە بۆ سالانی مندالیت، تا بەلکو کارێکت وەبیر بێتەوە، هەر کارێك کە ئەنجامت داوەو هەستت بە چێژوخۆشی کردووە لە کاتی ئەنجامدانیدا، هاوکات ئایا جگە لە یاسا هیچ مەیل‌و ئارەزوویەکی ترت نەبوو لە بوارەکانی تردا؟!

بۆ ماوەیەکی دوورودرێژ بە بێدەنگی دانیشت‌و بیری کردەوە، لە کۆتاییدا دەستی بە قسان کرد، وەکو ئەوەی شتێکی وەبیرهاتبێتەوە، دەستی بە گێڕانەوەی چیرۆکەکەی کرد: بەلێ باوکم تفەنگێکی گەورەی ڕاوکردنی هەبوو، زەمانێك بوو وازی لە ڕاوشکار هێنابوو، لە پڕ گەڕایەوە سەر ئارەزووی ڕاوکردن، گەڕا بە شوێن تفەنگەکەیدا، بینی وا ژەنگ دایپۆشیوەو بە کاری ڕاو نایەت، بە ناچاری فڕێی داو بیری دەرچوون بۆ ڕاوی لەگەل هاوڕێکانیدا وەلانا!

ئەو کات من هێشتا مندال بووم، تەمەنم لە سیانزە سال تێپەڕی نەکردبوو، باوکم زۆر خۆشدەویست، زۆر دلتەنگ بووم، بەوەی کە باوکم نەیتوانی بچێت بۆ ڕاو.

چووم بە ئەسپایی تفەنگەکەم هەلگرتو بردمە ژوورەکەی خۆم، هەموو پارچەکانیم کردەوەو پاشان خاوێنم کردەوەو ئەو ژەنگەم لا برد کە بەسەرییەوە بوو، بەشێوەیەك وەکو جاران نوێ بووەوە!

هەرگیز ئەو ڕۆژەم لە یاد ناچێت کە باوکم بە هەردوو دەستی بەرزی کردمەوە بەرەو ئاسمان‌و هاواری دەکرد، خودا تەمەن درێژو سەرکەوتووت بکات کوڕم!

کاتێك تفەنگەکەم چاککردەوە، جارێکی دیکە بە کەلکی ڕاوکردن هاتەوە، هەستم بە شانازی‌و خۆشحالییەکی وەها کرد، کە بە هەموو دونیا بەراورد نەدەکرا، باوکم لە پاداشتدا بە جونەیهێك خەلاتی کردم.

هالدین دەلێت: دواتر پرسیارم لێکرد: ئایا کاری هاوشێوەی ئەمەت ئەنجام نەداوە، لەدوای ئەو کارەت؟

یاخود هەولت نەدا شتێکی تری مالەکە چاك بکەیت، کە خراپ بووبێت؟

گوتی: بەلێ، ئەنجامم داوە، ماکینەی ڕستن‌و چنینەکەی دایکمم چاککردەوە، کارەبای مالەوەم چاکرد، دوای ئەوەی کە جارێکیان بڕا، پاسکیلی خوشکە بچکۆلەکەم چاککردەوە، هەموو جارێکیش هەستم بە چێژو خۆشییەکی بێ سنوور دەکرد لە کاتی ئەنجامدانی کارەکەمدا!

منیش لە کۆتاییدا بە کابرام گوت: ئەزیزم جێگەی تۆ کارگەیەکی گەورەیە، نەك نووسینگەی پارێزەری!

- بەلام من یاسام خوێندو باوکیشم ئەوەی دەویست.

- - ئەی بۆچی ئەندازیاری ناخوێنی؟

- ببمەوە بە خوێندکار دوای تەمەنی چل سالی؟

- بەلێ، پەیوەندی بکە بە کۆلێژی ئەندازیارییەوەو بخوێنە، تۆ بۆ ئەوە دروست بوویت کە ببیت بە ئەندازیار.

ئایا دەزانن کە ئەم پارێزەرە سەرنەکوتووە، بوو بەناوبانگترین ئەندازیار لە بەریتانیادا، دوای ئەوەی تەمەنی لە پەنجا سالی تێپەڕاند؟!

لەم چیرۆکەوە فێردەبین:

١- زۆرجار مرۆڤ بە نرخترین شتی لێ ون دەبێت، کە خودی خۆیەتی، ئەو کاتەش کە مرۆڤ خۆی ون دەکات، ئیتر سەرگەردان دەبێتو هیچ لە لای ئەو بایەخی نامێنێت!

٢- زۆرجار مرۆڤ گەنجینەیەکی پڕ لە بەهرەیە، بەلام بۆ چەندین سال‌و لەوانەشە بۆ هەتا هەتا فەرامۆش بکرێت!

٣- نابێت بە زۆر داهاتوو و چارەنووس بسەپێنین بەسەر مندالەکانماندا، بێئەوەی بزانین لە چیدا بەهرەمەندن‌و بۆچی کارێك دەشێن.

٤- ئەگەر ئێمە نەمانتوانی سوود لە بەهرەو تواناکان وەربگرین، ئەوا بە دەستی خۆمان بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆ، زیندە بەچالیان دەکەین!

٥- زۆرجار هۆکاری شکستەکانمان دەگەڕێتەوە بۆئەوەی کە ئێمە لە بوارێکدا کاردەکەین، کە بواری مەیدانی خۆمان نییە.

٦- پێویستە هەلبژاردنی پسپۆڕییەکان بە پێی ئارەزوو شارەزایی‌و بەهرەمەندی بێت، نەك تەنها پێوەر تاقیکردنەوەی گشتی‌و نمرەی دیاریکراو بێت!

پلانسازی شار

# شێوازی شارسازی مۆدێرن



بەشی پێنجەم

ئا: بەهەشت عەلی

تریەی دڵی شارسازی مۆدێرن بریتییە لە دیزاینی گەڕەك، كە لە ١٣ ڕەگەزدا جێگیرو دیاری دەكرێت، ناسراوانی ئەم بنەمایە دوو دیزاینەرو پلانسازی شار (ئەندێرز دونیو ئیلیزابێث پلاتر – زیبرکت)ن.

گەڕەكێكی مۆدێرن كە پشتی پێببەسترێ بە شێوەیەكی باش دەبێت زۆرترینی ئەم ڕەگەزانەی تێدا بێت:

١- گەڕەك پێویستە سەنتەرێكی تێدا بێت، بەشێوەی مەیدانێكو فەزایەكی سەوزو لە هەندێ شوێنیشدا شەقامێكی گەورەو فراوان گرنگەو ویستگەكانی گواستنەوەی هاوڵاتیان لە ناوشاردا دەتوانن لەم سەنتەرەدا ڕیزبگرن.

٢-زۆرترینی خانووەكانی نیشتەجێبوون لەناو سەنتەردا بە دووری ٥ خولەك، یان دووری ٢٠٠٠ پێ بنیاتبنرێن.

٣- شێوازی جیاواز لە خانووی نیشتەجێبوون لە خۆ بگرێت، بە تایبەتی خانووی تاك، ریزێك لە خانوو، ئاپارتمانو تەواوی چینو توێژەكانی كۆمەڵگا لە پیرو گەنجو سەڵتو خێزاندارو هەروەها هەژارو دەوڵەمەند شوێنی نیشتەجێبوونیان بۆ دابین بكرێت..

٤- لە كەناری ئەم گەڕەكانەدا دووكانەكانو نووسینگە كارگێڕییەكان بەپێی پێویستو بە شێوازی جیاجیا هەن، تا پێویستیە هەفتانەكانی خێزانەكان دابین بكەن.

٥- ئەو بینا بچووكانەی كە پشتیان پێدەبەسترێ ئەو مۆڵەتەیان هەیە كە لە بەشی حەوشەی پشتەوەی ماڵەكان جێگیر ببن، ئەم بەشە دەتوانێت بەشێوازی یەكەی كرێ، یان شوێنكار، وەكو كارگەی پیشەسازی هونەری سودی لێ ببینرێت.

٦- قوتابخانەی بنەڕەتی ئەوەندە نزیك بێت لە ماڵەكانەوە كە منالان بتوانن بەپێ لە ماڵەوە بچن بۆ قوتابخانە..

٧- یاریگای بچووكو بەردەوام كراوەو نزیك لە ماڵەكان هەبێتو بە لایەنی كەمەوە دوورییەكەی ١٠ میل بێت.

٨- شەقامەكانی ناو گەڕەكێك بەشێوەی تۆڕی پێكەوە بەستراون، ئەدای ئەم شەقامانە بەشێوەیەكە كە بڵاوەپێكردنی ترافیك لە ڕێگای جۆرەها، ڕێڕەوی پیادەو ئۆتۆمبێلەوە بۆ هەر شوێنێك، زۆر گونجاوو باش كاردەكات.

٩- شەقامەكان تا ڕادەیەك باریكنو لە ڕێگای پۆلێك لە درەختەوە سێبەریان بۆ كراوە، ئەمەش ژینگەیەكی ئارامو گونجاو بۆ ئۆتۆمبێلەكانو پاسكیل سوارەكان دابین دەكات.

١٠- بیناكانی سەنتەری گەڕەك دەكەونە نزیك شەقامەكانەوە بە جۆرێك دروستكراون كە پەنجەرەكانیان دەكەوێتە ڕووی دەرەوەو بەسەر شەقامەكەدا دەڕوانێت.

١١- گەراجە گشتییەكان دەكەونە بەشی پشتەوەی شەقامەكانو دەخرێنە بەشی دواوەی بیناكانو عادەتەن لە ناو كۆڵانە لاوەكییەكانەوە دەیگەیتێ..

١٢- ئەو زەوییانەی كە هێشتا نەكراون بە هیچ شتێك كە لە كۆتایی شەقامەكە، یان لە سەنتەری گەڕەكەكەدان دادەنرێن بۆ بینا گشتییە گرنگەكانی شار ئەم شوێنە دیاری كراوانە بەكاردەهێنرێن بۆ بینای وەك سەنتەری ڕۆشنبیریو دینیو زانستیو ..هتد.

١٣- هەرگەڕەكێك بەشێوەیەكی ڕێكخراوو سەربەخۆیە، ئەنجوومەنەكان پێكەوە گفتوگۆو ڕاوێژ لە بارەی بابەتەكانی وەكو پاراستن، ئەمنییەتو گۆڕانكاری فیزیایی دەكەنو بڕیار دەدەن..

كەناری دەریای فلۆریدا نموونەی یەكەمین شارسازی مۆدێرنە كە فراوان بوونو بڵاوبوونەوەی لە ساڵی ١٩٨١ لەسەر هێڵێكی باریكی ٨٠ ئەیكەری دەستی پێكرد، ئەم كەنارە لەساڵی ١٩٨٨ زەمانێك كە تەنها چەند شەقامێك دروستببوون هاتە بوون، هاوكات لەگەڵ ئەوەشدا بە هۆی تەلارسازی تایبەتو باشی جۆری شەقامەكانو فەزاگشتییەكەیە لە تەواوی جیهاندا ناسرا..



# ئایا دەتوانیت (CV)ی خۆتم بۆ بنێریت؟

کەریم سمکۆ

ئەگەر کەسێك داوای لێ کردیت کە CV خۆتی بۆ بنێریت، چی دەکەیت؟ یان ئەگەر ڕۆژێك ئیمەیڵەکەت کردەوەو داوای CV یيان لێ کردبوویت چی دەکەیت؟ ئایا هەرگیز بیرت لەوە نەکردۆتەوە تووشی ئەم موفاجەئەیە ببیتو پێت ڕابگەیەنن: (ئایا دەتوانیت CV ی خۆتم بۆ بنێریت؟).

زۆرجار لە کاتی خوێندنەوەی ڕۆژنامەو گۆڤار، یاخود لە کەناڵە بینراوەکان، بەرچاومان کەوتووە کە کۆمپانیایەك، یاخود دەستگایەکی حکومی ڕیکلامی بۆ دامەزراندن کردووە لە دامەزراوەکەیدا، بۆئەوەی هەرکەسێك بیەوێت بەو مەرجانەی کە دەستگاکە، یان کۆمپانیاکە دایدەنێت هەڵیبژێرێتو دایبمەزرێنێت. یەکێکیش لەو خاڵانەی لە ڕیکلامەکەدا، یا لە ئاگادارییەکەدا هەیە، پەیوەندی کردنە بەو ژمارەیەی کە لە ئاگادارییەکەدا بڵاوکراوەتەوە، یاخود تێیدا نووسراوە(CV) خۆتان بۆ ئەم ناونیشانە ڕەوانە بکەن.

تاکو ئێرە لای هەموومان ئاساییە، بەڵام ئەوەی کە گرفتە هەندێك لە تاکەکانی کۆمەڵگای ئێمە شارەزاییەکی ئەوتۆیان نییە لە نووسینی (CV)، هەروەك هاوڕێیەکم لە زانکۆ بۆی باسکردم کاتێك مامۆستاکەیان گوتبووی: کێ سی ڤی خۆی هەیە؟ هاوڕێکەم وتی: کاتێك کە دەستم هەڵبڕیو دواتریش چاوم لە دواوەی خۆم کرد چەند قوتابییەك لەگەڵ من دەستیان هەڵبڕیبوو، ئەوانی دیکە چاوەڕوانی ئەوەبوون کە مامۆستاکە (CV) شی بکاتەوەو وردەکاریی نووسینی سی ڤی بۆ قوتابییەکان بەیان بکات.

ئەوەی کە ئێمەی واراهێناوە لەوەی کە شت فێرنەبینو شت نەزانینو لامان نامۆ بێت، پرسیار نەکردنە. زۆرێك لە تاکەکان پێیان وایە ئەگەر پرسیار لە شتێك بکەن کە نەیزانن عەیبەیە، بە پێچەوانەوە ئەوەی کە هەمیشە پرسیار دەکات تاکێکی سەرکەوتووەو نایەوێت لە کاتی ڕووبەڕووبوونەوەی پرسیارێکدا تووشی وشەی(نازانم) ببێت. ئەو تاکانەش هەمیشە لە کارەکانیان ئیرادەیان بەهێزەو هەردەم هەوڵدەدەن سەرکەوتن بەدەست بهێنن.

لێرەدا پێویستە هەموو تاکێك بزانێت کاتێك داوا لە دامەزراوەیەك دەکات بۆ دامەزراندن، سی ڤی خۆی بەبێ کەموکوڕی بنووسێت، یاخود بزانێت شێوازی سی ڤی نووسین چۆنە، لەوانەیە زۆرێك لە تاکەکان وابزانن کە سی ڤی نووسین تەنها ناوی سیانیو تەمەنو بڕوانامەیە، بەڵام لێرەدا شێوازی نووسینی سی ڤی دەخەینەڕوو:

**Cv چییە؟**

Cv یان resume ، بە کوردی بە واتای زانیاری تەواوی کەسێ دێت، لێرەدا وشەی (سی ڤی) کە زۆربەی تاکەکان لە ناو کۆمەڵگاکاندا بەکاری دەهێنن، دەتوانین بڵێین: (بریتییە لە نووسراوێکی کورت بۆ وەسفکردنی بەهرەو شارەزایی تاك، ناساندنی تاك، ئەو کارانەی پێشتر ئەنجامی داون، ئارەزووی کەسی، پەروەردەو خوێندەواری تاکەکە.... هتد، کە دەینێریت بۆ ئەو شوێنەی داوای دامەزراندنی لێ دەکەیت، کاتێك دەتەوێت دابمەزرێیت).

بەشەکانی CV.

- ناوی خۆت.
- ڕەگەز.
- ناونیشان.
- شوێنی کارکردن.
- ئامرازی پەیوەندیکردن (ژمارەی مۆبایل/تەلەفۆن).
- پێگەی ئەلیکترۆنی(ئیمەیل).
- شوێنو بەرواری لە دایکبوون.
- ئەزموونی پێشووت.
- باری کەسێتی.
- ڕەگەزنامە.
- ژمارەی پاسپۆرت.
- گروپی خوێن.
- بڕوانامە.

هەموو کاتێك کە زانیاریت لەسەر ئەو شتانە هەبوو کە زۆر پێویستن لە ژیاندا، زۆر بە ئاسانی دەست بۆ کیبۆردەکەت دەبەیتو CV ی خۆت پڕ دەکەیتەوە، بە کلیکێك بۆ ئەو شوێنەی مەبەستە دەینێریت.

ئا: خەندە ڕەمەزان - زکرا ڕەمزی



# گەندەڵی کارگێڕی

بەشی سێیەم

بەندی یەکەم:

مەترسییەکانی گەندەڵی:

گەندەڵی مەترسیدارە لەبەر چەند هۆیەك هۆیەکانیش:

- بوودجەی سەر لێشێواو.
- نەبوونی خزمەتگوزارییەکان.
- بەرزبوونەوەی نرخ.
- ڕێگرە لە بەردەم هەنگاونان بەرەوپێشکەوتن.
- لاوازبوونی سیستەمی دیموکراتی.
- سەقام گیرنەبوونی ئاشتیو ئارامی.
- برەودانە بە توندوتیژی.
- لە بری ئەوەی دەوڵەت حاکم بێت، گەندەڵەکان سەروەرن.
- دژایەتیکردنو دەسەڵاتی چوارەم.
- زۆربوونی کێشە کۆمەڵایەتییەکان.
- لاوازیو شکانی بازاڕ.
- بڵاوبوونەوەی نەخۆشییەکانی سەردەمو هەژاریو قاتو قڕی.
- نەبوونو ڕێگەنەدان لە هەندێ شوێن بۆئەوەی کەرتی تایبەتی لە ناوەو دەرەوە ڕۆڵی خۆیان بگێڕن، واتە لاوازی، یان نەبوونی (وەبەرهێنان).
- زاڵنەبوون بەسەر نەخوێندەواریو نزمبوونەوەی ئاستی زانست.
- لە گەندەڵی کارگێڕیدا بڵاوبوونەوەی بەرتیلو ساختەکاری گۆڕینو دەستکاری لە یاساو ڕێنماییەکان بە مەبەستی ڕێخۆشکردن بۆ جێبەجێکردنی مەرامی تایبەت.
- ونبوونی بەرپرسیاری لە هەموو بوارەکان، واتە کەس خۆی ناکات بە بەرپرس لەبەرئەوەی کێشەکان لە ئەنجامی گەندەڵییەوەن، ئەگەر دەسەڵات، یان دەستڕۆیشتووەکان بەشێك بن لە گەندەڵی، کەواتە بەهاکان چاوەڕێی قەدەرن.
- دەستێوەردانی بێگانەو کۆمپانیاکان لە کاروباری وڵات.
- مامەڵەکردن لەگەڵ هەر وڵاتێك، کە بە گەندەڵی تاوانبار دەکرێت دەبنە مایەی ڕیسوایی.
- شکاندنی کەسییەتی تاكو کۆی کۆمەڵگە.
- ئەو خزمەتگوزاریانەی کە دەشکرێت چ لە ڕووی باشو خراپی، یان گرانیو هەرزانی، یان زۆرو کەمی بێبایەخن.
- دەبێتە هۆی چاولێکەری ئەوەی کە توانایەکی هەبێت دەست بە گەندەڵی دەکات.
- نەمانی متمانەو بڕوا پێبوون.
- نەبوونی پێوانەی لێپرسینەوە.
- تەشەنەکردنی گەندەڵی وەك زنجیرە، لە نێوان (بازاڕ) کڕینو فرۆشتن.
- یاساکان بێبایەخ دەبن.
- لاوازی شیرازەی ڕێکخستنی ناوخۆ، کەمی خوڵقاندنی پلانی نوێ، (پەیڕەوکردنی بەرنامەی لاوازو کۆن دوور لە پەرەپێدان).
- ڕۆتین هاندەرە بۆ گەندەڵی ئیداری، هەمیشە ئاسانکاری ڕێگرە لە بەردەم گەندەڵی، بۆیە گەندەڵی کارگێڕی سەرچاوەیەکی سەرەکییە لە گرێ کوێرەو بەربەست لە ڕێگەی بەرێنەکردنی مامەڵەکان.
- گەندەڵی دەبێتە مایەی دابەشبوونی چینەکان بۆ دووچین: چینی مشەخۆر دەوڵەمەندی بێ سنوور، دەستبەسەراگرتنی سەرچاوەکانی ئابووریو بازرگانی، دووەمیان چینی کەمدەرامەتو هەژار، کە چاوی لە دەستی چینی یەکەمە کە دەسەڵاتی بەدەستە.

بەندی دووەم/ بەرتیل:

ئەم دیاردەیە سەرجەم ئاستە جیاجیاکانی بەرپرسە حکومییەکانی گرتبووەوە، ئەمەش بە وەرگرتنی

پارەی کاش، یان بەش، لە پڕۆژەی ئابووری، یان کەلوپەلی عەینی، وەك ئوتومبێلو بەرووبومی کشتوکاڵیو شتی تر، بەرامبەر کارێك کە بەرپرسە حکومییەکە بۆ کەسی بەرتیلدەر ئەنجامی دەدات، وەك: (پێدانی مۆڵەت، دامەزراندن، ناردنەدەرەوە، وەرگرتنی زەوی، گۆڕینی شوێنی زەوی، بەردانی گیراوان، ....هتد).

دیاردەکانی گەندەڵی:

دیاردەکانی بەڕێوەبردنو حکومی لە کوردستان بەشێوەیەکی گشتی لەم قۆناغەدا:

١- دیاردەی ڕۆتین لە فەرمانگەکانی حکومەت.

٢- واسیتەو لایەنداری (المحسوبیە والمنسوبیە).

٣- تێکەڵاوبوونی دەسەڵاتی حیزبو حکومەت.

٤- نەشارەزاییو بێتوانایی لە بەڕێوەبردندا.

بەندی سێیەم: لاوازی لە بوونو وەدیهێنانی شەفافییەتدا:

بە پێی یاسا بە مەبەستی بە فەرمی ناساندنی (لایەنی تاکە کەسی) هەر ئەندامێکی کۆمەڵگە لەهەر ئاستێکدابێت، ناوەندە یاساییە بڕیار بەدەستەکان، وەك تۆمارگەی تۆمارکردنی ناسنامەی باری کەسایەتیو فەرمانگەی تۆمارکردنی کۆمپانیاکان، لەسەر بناغەی بەڵگەو مەدارێکو بە گوێرەی ناونیشانو زانیارییەکانی ئەو کەسە. مۆری پەسەندو ڕەزامەندی لە دەستنیشانکردنی ناسنامەی تاکە کەسی، ژمارەیەکی تایبەتی بۆ دیاری دەکەن، کە بەدەرکردنی کارتو کۆدی نەتەوەیی، ئەو کارە مەودایەکی زیاتر دەتەنێتەوە.

سەرەکیترین هۆکارو بواری هاتنە کایەی گەندەڵی لە هەر وڵاتێکدا، دەشێ بریتی بێت لە بوونی خاڵی لاوازی زۆرو جۆراو جۆر لە بەڵگە سازی چالاکییە سیاسیو ئابووریو بارودۆخی دارایی خەڵکانی یاساییو ئاسایی دا. سروشتییە لە وەها بارودۆخێکدا ئاستو چۆنییەتی چالاکی کەسە چالاکەکان لە ئاڕاستەی ئەرێنیو نەرێنیدا، بە پشتبەستن بە بەڵگەکان لە ئاستی نیشانداනو بەرگریکردندا نابێت. ئەنجامو ئاکامی ڕاستەوخۆی ئەم کەمو کورپیە (بەڵگەنامەی دروست نەکردن) ڕێگرتنە لە وەدیهێنانی شەفافییەت لە چالاکییە ئەنجامدراوەکانو باری دارایی کەسەکاندا، کە ئەم کارەش (نەبوونی شەفافییەت لە چالاکییە ئابووری، سیاسی، بەڕێوەبردن، کۆمەڵایەتیو فەرهەنگییەکاندا)، هۆکاری سەرەکی سەرهەڵدانی گەندەڵییە لە هەر وڵاتێکدا، بۆیە پێویستە لەو ڕاستییە ئاگاداربین کە (شەفافییەت) بەبێ (بەڵگە سازی) دەست ناداو بەشێوەیەکی گشتی ئەم دووانە، تەواوکەری یەکترن، واتە لەهەر جێگایەك شەفافییەت هەبێت بەڵگە سازی هەیەو بەپێچەوانەشەوە.

دووڕوویيو شێوازەکانی

یەکەم: پێناسەی دووڕوویی:

دووڕوو ئەو کەسەیە کە وەفای نییەو شایەنی متمانە نییە، هەموو ئەو ڕەوشتە خراپانە دەگرێتە خۆی کە دەخرێتە پاڵ کەسێك، بەبێ بەڵگە.

- دووڕوویی بەبیانوو: ئەم جۆرە دووڕووییەش لەپاڵ جۆری یەکەمدایە، دووڕووی بەبیانوو، لەسەر چەند هۆیەکی گونجاو وەستاوە کە زۆر لەگرفتەکان بە هۆیەوە ڕوونادات، بەڵکو هۆیەکە بۆ ڕوونەدانی باڵاکان، چونکە زۆرجار دووڕووی بە بیانوو باشترەو چارەسەرە بۆ گرفتەکان، بەڵام پێش ئەوەی ئەم جۆرە دووڕووییە ڕوون بکەیتەوە، بە ئارەزووی خۆت دەست بکەیت بە فێڵکردن لە خەڵك دەبێت هەمیشە لە بیرت بێت کە ئەمە دوایین ڕێگایەکی ڕەوشتییە بۆئەوەی بیگریتەبەر لە چارەسەرکردنی گرفتێك، لە هەمان کاتدا پێویستە دووركەویتەوە لە درۆکردن، تاکو بە کەسێکی کەم لە قەڵەم نەدرێیت، ئاڕاستەکردنی ڕەخنەو چەند ڕەوشتێك کە تێیدا نییە. بۆیە (دەستپاکی - ڕاستگۆیی) سیاسەتێکی سەرکەوتووەو لە سەدا سەد، باشترە لە شاردنەوەی هەستەکانت، دەبێت وەکو پەرتوکێکی کراوە بێت، ڕاستگۆبیت بۆئەوەی دووركەویتەوە لە هەڵەکردنی ڕەشەبا بە ڕووتدا، سادەترین ڕێگا بۆ دووركەوتنەوە لە دووڕوویی بێدەنگ بوونە. ئەگەر قسەکردن ئاڵتوون بێت، ئەوا بێدەنگی مروارییە. ئەمەش وادەکات نەکەویتە نێوان سەرسووڕمانی شیرینو خۆشەویست، ڕاستگۆیی تاڵ و ناخۆشی.

- کەی دووڕووی بە بیانوو ڕەوا خۆشەویستە؟ زۆرجار هەندێك بارودۆخ وات لێدەکات مجامل بیتو دوور لە بەکارهێنانی وشەی (دووڕووی بە بیانوو) ئەو کاتە دەردەکەوێت، هۆیەکانی ئەمجۆرە دووڕووییە لە لایەنی تۆو کەسانی تر، بەڵام لە هەمان کاتدا ئایا تۆ ئامادەی بۆئەوەی ڕاستگۆ بیت، لە هەموو کاتو شوێنێکدا ئامادەی بۆ ئەنجامو ئاکامەکانی! گەر باوەڕت وابوو کە باشترین ڕێگایە، گوێش بەوە نادەیت بۆ ئەو گرفتانەی کە بۆ خۆتی دروست دەکەیت، یاخود ئەوەی کاردەکاتە سەر تەندروستیت، لە هەمان کاتیشدا واز لە ڕاستگۆیی ناهێنیت بە هەر نرخێك بێت، دەتوانیت هەندێك ئاکاری بۆ زیاد بکەیت، کەوا لە شتە قورسو زەحمەتەکان ئاسانو نەرم بکەیت لە کاتی مامەڵەکردنو هەڵسوکەوت کردندا.

* چۆن دووڕوو دەناسیتەوە؟

یەکەم ڕەوشتیان گواستنەوەی هەواڵ و گێڕانەوەی هەر زوو کە هەستی کرد حەز دەکەیت گوێت لە هەواڵ بێت، ئەوا دڵی خۆیت بۆ دەکاتەوەو هەموو متمانەی خۆیت پێدەدات، کەسی دووڕوو دوور دەکەوێتەوە لەوەی چاوی پێت بکەوێت بە تەنیا لە کاتی بوونی گرفتێك کە خۆی هۆکارییەتی لەگەڵتدا دابنیشێ، تەنها گەر شتێکی بە دژی بەرامبەری هەبێت بە بیری بێنێتەوە.

بۆیە گەر کەسێکت دی هاتە بەرامبەرت ویستی هەواڵێکی گرنگت پێ بڵێتو لە ناکاو بابەتەکەی گۆڕی، چونکە نازانی بۆچوونی تۆ چۆنە، بۆ بابەتەکە، ئا یا نەرێنییە، یان ئەرێنی، ئەوە بزانە ئەو کەسە دووڕووە بە پلەی (١٠٠٪). دووڕوو کەسێکی زمان لووسو قسە شیرینە، هەوڵ دەدات دڵت خۆش بکات بە باس کردنت بە چاکە، بە هەمیشەیی هێورت دەکاتەوە، بەڵام لە ڕاستیدا وا چاکترە وای بۆ بچیت کە هەڕەشە کردنە، یارمەتیدانی بۆت پێویست ناکات، چونکە وانیشان دەدات کە لە دواوە دەتڕووخێنێت بە تایبەتی لە بواری کارکردندا.

ئا: نەریمان بەهرام

بەشی چوارەم



# کارگێڕی ئیلکترۆنی

**٥- کـــارمەنـــدی مرۆیی (Human cadre):**

هێزی کار پێکدێت لە کۆمەڵێك کەسـی کارپێکراو بە کردار، ئەو کەســانەی کارییان نییــە، بەڵام بە دوای کارەوە هەوڵێکی تەواو دەدەن، دەچێتە قاڵبی کاری کۆمەڵێك کرێکار لە هێــزی چەکداری، هەر کەسـێك کارێکی هەبێتو واز لە کارەکەی بێنێت، بە هۆی لە کارکەوتنو نەخۆشی، یان بە هۆی مانگرتن، پیشەسازیو خراپی کەشو هەوایە.

هێــزی کار یەکســان نابێت بە هەموو دانیشــتووان، تەنانــەت یەکســان نابێــت بــە نیوەی دانیشــتووانیش، لــە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریـکا هێزی کار، پێش شــەڕی جیهانــی دووەم یەکســان بووە بە ڕێــژەی ٤٠٪، بــەڵام دوای شــەڕی جیهانی زیــادی کردووە بۆ لە ٤٥٪، ئەوەی جەخت دەکاتەوە لە ســەر هەبوونی هەندێك تاك کە دەبێــت دوور بخرێتەوە لە هێزی کار، ئەو کەسانەی کە دوور بخرێتەوە لە هێزی کار، ئەوانە ئەو تاکانەن کە بوونیان نییە لــە بازاڕی کار، یان ئــەو تاکانەن کە هیچ کارێکیان نییە، بە دوای کاریشدا ناگەڕێن.

کەواتە نەبوونی ئەم لایەنەش دەبێتە هــۆی ئــەوەی کــە کارگێــڕی ئەلکترۆنی دروست نەبێت، چونکە ئەم لایەنە لایەنێکی گرنگی بواری کارگێڕی ئەلکترۆنییە، بۆیە پێویستمان بە کارمەندی پسپۆڕو شارەزاو لێهاتوو هەیە، بۆ ئەوەی ئەم لایەنە گرنگە دروســت بکرێــت ئــەوە دەبێت کەســانی پسپۆڕو شــارەزاو لێهاتوو بێنین مەشق بە کارمەندانی کوردســتان بکــەن، بۆئەوەی بە تەواوی شــارەزابن لە بــواری کارگێڕی ئەلکترۆنیدا، پاشــان دەتوانین بە تەواوی کارگێڕی ئەلکترۆنی دروست بکەین.

**٦- بنکــەی زانیاری (Information center):-**

بنکەی زانیاری لــە توانایدایە هەموو ئەو داتایانە، واتە زانیارییە پێویستییەکانی دامو دەزگایەکــی تایبەتــی، ڕێکبخاتو لە ڕێــی تــۆڕی کۆمپیوتەریشــەوە، هەمــوو فەرمانبــەران، زانیارییــەکان لەگەڵ یەك دابــەش بکــەن، زانیارییەکانیش دەکرێت دەربــارەی ئەم کڕیار، یان فرۆشــیار بێت، ئەم قوتابی، یان مامۆســتا بێت، شتومەك یان نرخ بێت. هەروەها...

هــەر بــەو چەشــنە تەکنەلۆژیــای نــوێ هەمــوو فەرمانبەرێکــی کردووەتە بەکارهێنــەری تەکنەلۆژیــای زانیــاری، ئەمــەش ناکۆکییەکــی قووڵی لــە نێوان شــێوازی کــۆنو نوێــی بەڕێوەبەرایەتــی کردندا دروستکردووە.

**٢-٤ جۆرەکانــی تــۆڕی کارگێــڕی ئەلکترۆنی:**

**١- تۆڕی ناوەکی:**

تــۆڕی ناوەکی بریتییە لەو تۆڕەی کە لە پێناو زانیارییەکانی ناوەوەی کۆمپانیاکە سازکراوە، بە هۆی بەکارهێنانی چەمکەکانو ئامێــرەکانو تواناکانــی ئینتەرنێــت، بە تایبــەت هەڵدانەوەی ئاســانو بێ زۆر لە خۆکردن، هەروەها تــۆڕی پەیوەندییەکان کارمەندانــی کۆمپانیاکــە دەتوانــن ئــاگاداری بڕیــارەکان بــن، نەخشــەکان، پــرسوڕاکانو داوای زانیارییــەکانو گەڕانەوەی ڕاگەیەندراوەکان لە دەستووری ڕاگەیەنراوەکانی کۆمپانیاکە.

هەروەها تۆڕی ناوەکی یاسای بەریدی ئەلکترۆنی جیهانــی دەخاتەڕوو، هەروەها گەیشتن لە دوورەوە، ئامڕازەکانی هاوبەش پێکردنــی کۆمەڵایەتــیو یاســاکانی بەش بەشــکردنی، بــە مەرجەکانــی مەشــقو ڕاهێنــان، کەوا دەکات کــە کۆمپانیاکە بە شێوەیەکی چاکتر وەك یەك یەکە کاربکات. تۆڕی ناوەکــی تایبەتمەندی دیکەی هەیە، گرنگترینیــان: دەوڵەمەندکردنی ژینگەی زانیارییەکانی کۆمپانیاکەیە بە شێوەیەکی خێرا، بەش بەش دەکرێت، بە دەنگهاتنێکی خێــرا لە لایــەن ســەرجەم ئەرکــەکانو بەشــەکانی کۆمپانیاکــەو ئەوانــەی لەوێ کار دەکــەن، کەمتێچوونــی دابەشــکردنی زانیارییەکان، توانستی بەکارهێنانی تۆڕی

ناوەکی بۆ پێکهاتەی جیاوازی گریمانەیی. هەروەها بەستنی کۆنگرە گریمانەییەکان لە نێوان کارکەرانی کۆمپانیاکەدا، جا هەر چۆنێك بێت دابەش بوون لە ڕووی جوگرافیاوە، لە هەمووی گرنگتر ئەوەیە کە گۆڕان لە کۆمپانیاکاندا زۆر بەرزە. لێکۆڵینەوە لەسەر ئەو کۆمپانیایانەی تۆڕی ناوەکی بەکاردێنن، ئەنجامدراوە کە گەڕاوەکەیان لە نێوان (٢٣-٥٨٪)، (٢٦) لە کاتێکدا لێکۆڵینەوەی دی کە ئەنجام دراوە کە کۆمپانیای (Empire district electric ) خاوەن (١٤٠) هەزار ساڵ کە تۆڕی ناوەکی لە کار خستووە بە تێچوونی (٥٠٠) هەزار دۆلار ، دەریخستووە کە گەڕاوەی وەبەرهێنانەکەی گەیشتۆتە (٣٧٪)، هەروەها چەندەها هەنگاوی دی هەن کە دەبێت ڕەچاو بکرێن لە کاتی بنیاتنانی تۆڕی ناوەکی.

٢- تۆڕی دەرەکی:

بەڕاستی ئینتەرنێت بەشدار بووە لە گۆڕینی ئەو بۆ چوونەی کە پێی وایە دەبێت تەواوی توانا جەوهەرییەکان لە ناوەوەی کۆمپانیا بن‌و بۆ ناوخۆ هاوردە بکرێت. بۆئەوەی بە ئاڕاستەی کامڵ بوونی گریمانەیی بگۆڕدرێت. ئەوەی لە سەر بنچینەیەك وەستاوە کە دەشێ هەندێ لە توانا جەوهەرییەکان لە ناوخۆی کۆمپانیاکاندا بن (ئەو توانایانەی کە کۆمپانیاکە بە هۆی ئەوەوە بەسەر ڕکابەرەکانی سەر دەکەوێت)، هەروەها هەندێکی تر لە دەرەوەی کۆمپانیاکە (ئەوەی لای هاوردەکان، یاخود ڕکابەرەکان). هەر بۆیە کۆمپانیا هەوڵی ئەوەی دا کە تۆڕەکانی ناوخۆی فراوانتر بکات، بۆ تۆڕی دەرەکی.(Extravert) بۆ ئەوەی ئەوانی دەرەوە تێیدا بەشدار بن.

هەروەکو تۆڕی دەرەکی چەمکی کارە گریمانەییەکان دادەڕێژرێت. بەوە کە ڕێگا بە کۆمپانیاکان دەدات، بە کۆمپانیا ڕکابەرەکانیشەوە، بۆئەوەی بەشدار بن لە زنجیرەی داڕشتنی بەها بۆ ئەو کۆمپانیایە کە مەبەستمانە.

تۆڕی دەرەکی توانای ئەوە بە کڕیارو هاوردەکاران دەبەخشێت کە بتوانن بنەماو گەنجینەی ڕاگەیاندراوی کۆمپانیاکە دابەش بکەن بۆ ئەوەی بەشداربن لە پەرەپێدانی پەیوەندییەکانی گرێبەستی لە سەر ئەو بەش‌و پێکهاتانەی کە کۆچینەرخانەی پیشەسازی‌و بەرهەمەکانی. ئەوەش وا دەکات زۆربەی توانا گرنگ‌و جەوهەرییەکەی دەرەکی بێت. بەڵام تۆڕە دەرەکییەکەی یارمەتیدەر دەبێت بۆ گۆڕینی بۆ توانا ناوخۆییەکان، هەروەکو کۆمپانیای دێڵ (Dell) دەیکات لە دەروازەی کامڵبوونەوە ستونییە گریمانییەکەیدا.

هەندێ (مزایا) دەسکەوت هەن ئەم کامڵبوونە گریمانەییە وەدی دێت، کە بەندە بەوەی کە ئەم کۆمپانیایە چەندین بەش بەرهەم دەهێنێ‌و بەمەشەوە سەرکەوتنەکەی بەدەست هێناوە کە توانای کۆمپانیاکانی ترەوە نییەو لە ڕێگای تۆڕێکی دەرەکییەوە دە بەسترێتەوە بۆ ئاڵوگۆڕی زانیاری پێویست لە بارەی دیزاین، چەندایەتی، کات‌و تایبەتمەندییەکاندا.

## ٢-٥ ئاستەنگەکانی بەردەم کارگێڕی ئەلکترۆنی:

سەبارەت بە ئاستەنگەکانی بەردەم کارگێڕی ئەلکترۆنی بە گشتی ڕۆڵی کارەبا بە تایبەت گرنگی خۆی هەیە، (بۆیە لێرەدا ڕۆڵی کارەبا دەبێت بەرز بنرخێنرێت، لە پێناو سەرخستن‌و بەردەوامبوون لە سەریدا، واتە دەبێت بزانین کە ئەم گیروگرفتانەش دیسانەوە ڕۆڵیان هەیە کە پەیوەندی بە ناتەواوی‌و نارێکی کارەباوە هەیە، ئەمانەش گرفتەکانن:

١- نەبوونی کارەبا بە شێوەیەکی بەردەوام لە گشت هێڵەکانی ناو شارۆچکەکاندا.

٢- کوژانەوەو هەڵگیرساندنی کارەبا لە ماوەی شەوو ڕۆژێکدا بە شێوەیەکی پچڕپچڕ ناتەواوی بۆ چەند جارێك.

٣- ڕێکنەخستنی فۆڵتییەی کارەبا لە مۆلیدە ئەهلییەکان، یان کاتێك کە تەزووی نیشتمانی دەگەڕێتەوە ، دەبینین بە شەپۆلێکی بە هێزەوە دادەبەزێت، کە هەندێجار لەوانەیە ببێتە هۆی سوتان‌و پەککەوتنی ئامێرەکە بەشێوەیەکی تەواو.

٤- جگە لە مانەش نەبوونی کارمەندی شارەزاو بە توانا کە بتوانێت لە کاتی نەبوونی‌و هاتنەوەی تەزووی کارەبا، بتوانێت کارەباکە بە شەپۆلیکی گونجاو دابەزێنێتەوە سەر ئامێرەکە، یان ئەگەر هەستی بە تاریکییەك کرد، ئەوە یەکسەر پێویستە تەزووەکە ببڕێت لە سەر ئامێرەکە، بۆئەوەی هیچ پەککەوتنێك‌و ناتەباییەك دروست نەبێت.

### هۆکارەکانی دروست نەبوونی کارگێڕی ئەلکترۆنی لە کوردوستان دەگەڕێتەوە بۆ:

کارگێڕی ئەلکترۆنی کە بریتییە لە: (ڕاپەڕاندنی ئیش‌و کاری خەڵکی بە هۆی ئینتەرنێت، یان بە شێوەی ئەلکترۆنی لە جیاتی شێوە کۆنەکەی، واتە لە جیاتی ئەوەی خەڵك بچێت بۆ فەرمانگەیەك‌و مامەڵە جێبەجێ بکات لە ڕێگەی ئینتەرنێت، یان ئەلکترۆنی جێبەجێ دەکرێت، بێئەوەی کات بکوژێت، یان ماندوو بێت‌و بچێت بۆ ئەو فەرمانگەیە، بۆ حکومەتیش بە هەمان شێوە) ئەمە پێناسەیەکی کورتی ((کارگێری ئەلکترۆنی)) بوو.

### کێشەکانی نەبوونی (کارگێری ئەلکترۆنی) لە کوردستان:

١- نەبوونی ژێرخان لە ڕووی پەیوەندی تازەو هاوچەرخی بەرز، یا گونجاو بۆ پەیوەندیکردن‌و گۆڕینەوەی داتا چ بە هۆی وایەر، یان وایەر لێس، (واتە نەبوونی تۆڕی پەیوەندی پێشکەتوو).

٢- نەبوونی ئامێری ئەلکترۆنی گونجاو بۆ جێبەجێکردنی ئەم کارەو گۆڕینەوەی خزمەتگوزارییەکە، وەکو نەبوونی کۆمپیوتەری تایبەتی‌و لاپتۆپ‌و تەلەفۆنی ناوتۆڕ(هاتف الشبکی)، هەر ئامێرێکی تر بۆ بەکارهێنانیان بە نرخێکی گونجاو، جێبەجێکردنی ئەم کارە.

٣- نەبوونی هێڵی ئینتەرنێت، یان زۆربەی خەڵکی ئینتەرنێتی نییە، چونکە گرانە، یان ئەگەر هەشی بێت خێرا نییە بۆ ئەم کارە.

٤- مەشق پێکردن‌و ڕاهێنانی خەڵکی لە سەر بەکارهێنانی کۆمپیوتەرو ئینتەرنێت، یان کردنەوەی خوول بۆ خەڵکی، یان فەرمانبەران بۆ فێرکردنیان، بڵاوکردنەوەی ڕۆشنبیری لەسەر چۆنییەتی بەکارهێنانی خەڵکی بۆ ئەم کارانە.

٥- دەبێت تەمویل هەبێ لە لایەن حکومەتەوە بۆ لایەنی چاککردن‌و پاراستنی ئامێرو کەل‌و پەلی پێویست بۆ ئەم کارە، بۆ مەشق پێکردنی کادر بۆ ئەم مەبەستە، حکومەت ئاگادار بێت لە پێشکەوتنی تەکنەلۆژی‌و زانستی بە بەردەوامی.

٦- نەبوونی ئیرادەی سیاسی گونجاو، بۆ جێبەجێکردنی ئەم کارە.

٧- نەبوونی یاسای گونجاو، بە ڕێگە پێدانی ئەم کارە.

٨- نەبوونی ئاسایشی ئەلکترۆنی بەرز، بۆ پاراستنی نهێنییەکانی خەڵکی، یان حکومەت، چونکە ئەم لایەنە ترسناکە، لە ڕووی بڵاوبوونەوەی زانیاری.

٩- لە هەموو کێشەکان گرنگتر، نەبوونی کارەبا بە شێوەی بەردەوام بۆ خەڵکی.

و: شڤان گۆران




# نهێنی بڕیاردانی باش

"ئەو کەسەی کە هیچ جارێك هەڵەی نەکردووە، مانای ئەوەیە کە هیچ جار هەوڵی شتێکی نوێی نەداوە" ئەنیشتاین..

چەندجار لە ژیانتدا وازت لە ئەنجامدانی شتێك هێناوە لەبەرئەوەی نەتتوانیوە بڕیاربدەیت لە هەڵبژاردنی باشترین ڕەفتار، یان کردەوە؟ کەسانێك پلانیان هەبووە بۆ دەرکەوتن بۆ ژەمەخواردنێکی خۆش لەگەڵ هاوڕێکانیان، بەڵام لەبەرئەوەی نەیانتوانیوە خۆیان یەکلایی بکەنەوە کە کامە جۆری خواردن بخۆن ئیتالی، یاخود چینی، لەماڵەوە ماونەتەوە. ئایا دەتوانیت بیهێنیتە پێش چاوی خۆت کە هەڵبژاردن لە نێوان مانەوە لە کارەکانیانو قومارکردن لەسەر دەستپێکردنی ئەو کارەی کە هەمیشە خەونیان پێوە بینیوە، وەك چی وایە؟

ترس لە بڕیاردانی خراپ ڕێگە لە خەڵك دەگرێت لە ئەنجامدانی هەموو ئەو جۆرە شتانەی کە ئەنجام نەدانیان لەوانەیە باشتر بێت. ڕاستی مەسەلەکەش ئەوەیە کە هیچ ڕێگایەك نییە بۆ زانینی ئەوەی کە هەڵبژاردنێکی دیاریکراو بەرەو چ ئاڕاستەیەکت دەبات. دەتوانیت چەندین ساڵ بەسەر ببەیت لە بیرکردنەوە لە بارەی دەرەنجامە شیاوەکان، لە کاتێکدا جیهانی دەوروبەرت بەردەوامو بێ وەستان لە گۆڕانکاریدایە. ئەو ڕاستییەش وەکو خۆی دەمێنێتەوە کە لەوانەیە هەموو شتەکان لە کۆتاییدا ڕاست دەرکەون، یاخود هەموویان زۆر ناڕاست، گرنگ نییە چی هەڵدەبژێریت بۆئەوەی لە کۆتاییدا ئەنجامی بدەیت. هیچ لەمانە گرنگ نین، چونکە نهێنی بڕیاردانی گەورە کەوتنە داوی خۆشەویستییە لەگەڵ هەڵەکردندا.

زۆر لە خەڵکی هەڵەکردنو بڕیاردانی خراپ لە یەکتری جیاناکەنەوە، کە چی جیهانێك لە جیاوازی لە نێوانیاندا هەیە، زانینی ئەو جیاوازییانەش بە تەواوەتی ئاڕاستەی ژیانت دەگۆڕنو دەتبەن بۆ ڕێگایەکی تەواو نوێ.

هەڵە، ئەنجامدانی شتێکە لە کاتێکی دیاریکراودا کە تۆ پێت وایە باشترینە، بەڵام دواتر دەردەکەوێت کە بیرۆکەیەکی باش نەبووە بۆ تۆ. بڕیارێکی نابەجێ (خراپ)، ئەنجامنەدانی شتێکە بۆ ڕاستکردنەوەی ئەو هەڵەیەو پاشان ڕێگادانە بە دەرەنجامەکانی ئەم هەڵەیە کە بۆ ساڵانێکی درێژی داهاتوو پێناسەی تۆ بکەن.

چەند نموونەیەك:

هەڵە: پەیوەندی بەستن لەگەڵ کەسی نەشیاودا.

بڕیاری نابەجێ: پەیوەستبوون بەو کەسانەو خەمباربوون بە هۆیانەوە لە هەموو ژیانتدا.

هەڵە: هەڵبژاردنی شوێنێكو بە باشتر زانینی لەسەر شوێنێکی تر بۆ بەسەربردنی ئاهەنگی ساڵانە تیایدا.

بڕیاری نابەجێ: گەڕان بە دوای هەرشتێك کە بتوانیت بیدۆزیتەوە، بۆئەوەی ڕقت لە شوێنی یەکەم بێت، تەنها بۆئەوەی بیسەلمێنیت تۆ ڕاست بوویت لە بارەی چوون بۆ شوێنی دووەم، پاشان بۆ ساڵی دووەم دەگەڕێیتەوە شوێنی یەکەم! (ئێرە شوێنێکی چەند خۆشە!).

بڕیاردانی باش ئەوە ناگەیەنێت کە دەرەنجامەکان بزانیت پێش ئەوەی چەنسی ڕوودانی هەبێت. بەڵکو ئەنجامدانی هەر کردەوەیەك دەگەیەنێت کە هەست دەکەیت باشترینەو پاشان گرنگیدان بەو وانانەی کە دواتر لەگەڵیدا دەڕۆیت.

بڕیاردانی باش، شارەزاییە لە وەرگێڕانی ئەو زانیارییانەی کە دروستبوون، بە هۆی ئەو شتانەی ڕوویانداوەو هەڵبژاردنی

ئەوەی كە هەمان كار زیاتر ئەنجام بدرێت، یان ڕێگاكەت بۆ تێگەیشتنی بابەتەكە بگۆڕیت، تەنانەت لە هەندێ بارودۆخدا سەر لە نوێ دەستپێبكەرەوە. بە هەمان ڕێگەی ئەو فڕۆكەیەی كە نزیكی شوێنی مەبەست دەبێتەوەو بەردەوام چاودێریی دووریی ڕێگاكان هەوڵ بۆ ڕێكخستنی ئەو دوورییە بۆ كەوتنە سەر ئەو ڕێگایەدا دەدات، هەمان شتیش دروستە بۆ بڕیاردانی باش.

بڕیاردان لە هەر شوێنێك بێت ڕووداوێكی یەك كاتە نییە، بەڵكو پرۆسەیەكی بەردەوامو ئەندامییە كە پێویستە هەرچەند ژیان شتی نوێ ئاشكرا بكات، ئەمیش زیاتر پەرەی پێبدرێت.

ئێستا بیر لە بڕیارێك بكەرەوە كە نەتتوانیوە بیدەیت. ئەو هەڵبژاردنانە چین كە هەتە؟

تەنها بۆ كاتێكی كەم، با بڕۆین بۆ شیكردنەوەی ئەوەی كە كامە هەڵبژاردن پێت وایە دەبێت هەڵبژێریتو گوێ لە جەستەی خۆتو لە ژیریی خۆت بگرە. ئەگەر بۆ نموونە پێویست بوو كە بڕیارێك بدەمو ئەو ڕێسایانەی بەرەو ئەوەت دەبەن كە هەڵبژاردنی یەكەم هەڵبژێریت، ڕووت وەربگێڕی لە هی دووەم، ئەوا پرسیارێك دەكەم كە كامە هەڵبژاردن بوو كە بە نهێنیو لە قوڵایی دڵتداو پێش زانینی دەرەنجامەكان هیوات بۆ دەخواست؟

تەنها لەگەڵ حەزی سروشتی خۆت بڕۆو شتێك ئەنجام بدە تا وا لە هەڵبژاردنەكە بكەیت كە ڕووبدات. ڕازیبە كە هەڵە بكەیت، بزانە كە تاكە بڕیاری خراپ كە دەتوانیت بیدەیت لە پێناو ئەوە نەبووە كە شتێك ئەنجام بدەیت لە بارەی ئەو شتانەی كە نەتویستووە ڕووبدەن.

ئەگەر شتەكان بە ئاڕاستەی هەڵەدا چوون، ڕزایبە كە لە ئاڕاستەكەی تریش هەڵەیەك بكەیت، چونكە، كێ دەزانێت، لەوانەیە لە دواییدا دەربكەوێت كە بە هیچ شێوەیەك هەڵە نەبووە، بەڵكو دەركەوتنو بەدیهاتنی خەونەكانتە.

لە هەر بارودۆخێكدا بێت هەمیشە هەڵبژاردنت هەبێت، نیگەران مەبە لە بارەی ئەوەی كە دەبێت بە حیكمەتەوە هەڵبژێرین، ئەمە زیاد لە پێویست پیاهەڵگوتنەو زیادەڕەوییە.

سەرچاوە:
www.life-happens.co.uk



# ئاگات لە كاریگەریی یەكەم دیمانە بێت!

محەممەد هاشم

كاتێك بۆ پیشەیەك دەچیتە پێش، بڕێك بەربەستت دێنە پێش، كە پێویستە بە پێداگرییەوە بەسەریاندا تێپەڕیت، تا بەو پیشەیەی خەونی پێوە دەبینیت، بگەیت. سا بۆئەوەی خۆت بۆ چاوپێكەوتنو دیمانەی كار ئامادە بكەیتو شوێنەواری باش، لای ئەو كەسەی چاوپێكەوتنەكەت لەگەڵدا دەكات، بەجێ بهێڵیت، پێویستە پەیڕەوی لەم ڕێنوێنییانەی خوارەوە بكەیت:

١- پۆشاك: دەبێت باشترینو جوانترین پۆشاكی ڕەسمی خۆت لەبەر بكەیت، چونكە چاو یەكەم هەستە ڕووت تێدەكاتو هەست بە سەلیقەی شاراوەی كەسێتیت دەكات. دەشبێت خانمان، خشڵو كەرەسەی خۆڕازاندنەوە، زۆر بەكار نەهێنن، چونكە سادەیی جوانترەو بزەی سەرلێویش، باشترین خشڵو جوانی ئافرەتە.

٢- وەلانانی شپرزەیی: ئەگەر لەو كەسانە بوویت، لە كاتی چاوپێكەوتندا، بەدەست شڵەژاویو ڕاڕایی بێئەندازەوە دەناڵێنیت، ئەوا هەندێك ڕاهێنانی هەناسەكێشان بە كەڵكت دێت. ئەویش بەوەی هەناسەت بە چاونوقاویو سەر بەرەو ئاسمانەوە، بۆ ماوەی خولەكێك ڕابگریتو بەو پەڕی ئارامیشەوە هەناسەكە بدەیتەوە، یان دەست بە هەر شتێكەوە بگرە، كە لە بەر دڵتدا شیرینە، تا توندی شپرزەبوونەكەت كەم بكاتەوە.

٣- تەوقەكردن: بە كەم لێی مەڕوانە، چونكە تیغێكی دوو دەمەو بە هۆیەوە دەردەكەوێت كەسێكی بەهێزو دڵنیایت، یان شڵەژاوو ڕاڕایت. سا بەوپەڕی متمانەوە، لەگەڵ ئەو كەسەی دیمانەكەت لەگەڵدا دەكات، تەوقە بكەو چاویش بە هەموو لایەكدا مەگێڕە، بەڵكو بە بزەوە لە هەر دوو چاوی بڕوانە، تا باری دیمانەكە لەبار بكەیت.

٤- وەك خۆبوون: بەچەشنێك مەیە بۆ چاوپێكەوتن، كە وەڵامی زۆربەی پرسیارە باوەكانت لەبەر بێتو وەك تووتی بیانخەیتە بەر گوێی ئەو كەسەی دیمانەكەت لەگەڵدا دەكات، بەڵكو هەروەك خۆت بەو ڕاستبێژ بە. وا باشتریشە دیمانەكەت بە سڵاو لە كەسی بەرامبەرو ئەحواڵپرسی دەست پێبكات، پاشان بەو پەڕی بێفیزیو دەنگی ڕوونەوە، بچنە ناو ناخی وتووێژەكەوە.

٥- شێوازی دانیشتن: بەباشی هۆشیاری شێوازی دانیشتنەكەت بێت، قاچ لەسەر قاچ دامەنێ، یان بەتەواوەتی پشتت بەرەو دوا ڕامەكشێنە، چونكە ڕەنگە ئەوە، هەستی لەخۆباییبوون ببەخشێت.

٦- وادە: لە كۆتاییدا گەیشتنت لە وادەی دیاریكراو، یان تەنانەت لە پێش وادەكەشدا، لە بیرت نەچێت، چونكە ڕێزگرتنی وادە، یەكەم نیشانەیە، هەواڵی پابەندیو كارچاكیت، لە بەرامبەر پیشەی ئایندەتدا، دەدات.

علاقات:٥٣

مەسعود محەممەد هانەژاڵەیی




# ئایا کەسێکی فزولیت؟

خەڵکی سەدەهاجار لە نێوان خۆیاندا دەربارەی ئەمو ئەو و دەوروبەریان قسەدەکەن، لەوانەشە چێژ لەو قسانەش وەربگرن، بەڵام ئەم باسکردنەی ڕازی خەڵکی لای کەسانی تر، ڕەنگە کارێکی نەرێنی بکاتە سەر پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانو ڕێگربێت لە ڕۆماڵیکردنی دیاردەکە.

ئایا تۆ سەر بە کام گروپیت؟ ئەو تاقیکردنەوەی خوارەوە لەگەڵماندا ئەنجامبدە، تا بزانیت ئەو شتەی بەرگوێت دەکەوێت تاچەند پەسەندە لات بۆئەوەی هێڵی سور نەبەزێنرێت:

١- کەسێك لە کۆڵانەکەتاندا نیشتەجێ دەبێت، دەتەوێت بزانیت؟

أ- ناوی چییەو لە کوێیەوە هاتووە؟

ب- تاج ڕادەیەك، کۆڵانەکەی پێشووی خۆشدەوێت؟

ج- خەڵکی کوێیەو بۆچی ئەم گەڕەکەی بۆ مانەوە هەڵبژاردووە؟

٢- بە گشتی کاتێك کە پرو پاگەندەیەك دەبیستی:

أ- ئەم قسەیە لای خۆت هەڵدەگریت.

ب- وازی لێ دێنیتو هیچ نرخێکی بۆ دانانێیت.

ج- دەستدەکەیت بە بڵاوکردنەوەی ئەو قسەیە بە گەڕەکدا.

٣- هەرکاتێك یەکێك لە هاوڕێکانت کێشەیەکی هەبێتو پێویستی بە یارمەتی هەبێت، لەگەڵ چ کەسێك لەم بارەیەوە قسەدەکەیت؟

أ- لەگەڵ باوکی، یان دایکی، یان کەسێك لە ئەندامانی خێزانەکەی کە جێگای متمانەی ئەو بێت.

ب- لەگەڵ یەکێ لە هاوکارەکانی کە لەگەڵیدان.

ج- لەگەڵ هاوڕێکانی.

٤- بە بۆچوونی تۆ تاچەند ئەو پڕوپاگەندانەی دەربارەی کەسە جیاوازەکانی دەوروبەرت، دەیبیستیت، حەقیقەتی هەیە؟

أ- ٢٥٪. ب- ٥٠٪ . ج- ٨٥٪.

٥- ئایا تائێستا ڕازیبوویت بە وتنی ڕازی هاوڕێکەتو دوایش پێی گەشتبێتەوە؟

أ- نەخێر، هەرگیز. ب- بەڵێ، یەك جار. ج- بەڵێ زیاتر لە جارێك.

٦- کاتێك داوایەك دەخوێنیتەوە بەبێ هیچ شتێك وابیردەکەیتەوە کە:

أ- ناتوانم باوەڕبکەم کە ئەم داواکارییە تایبەت بێت بە هیچ کەسێکەوە.

ب- ئەم داواکارییە دەربارەی کێیە، گرنگە بۆ من؟

ج- بە هەر جۆرێ بێت ناونیشانەکەی پەیدادەکەم.

٧- دواجار، ئەگەر متمانەت لای کەسێك هەبوو، ڕازی خۆی بۆ گێڕایتەوەو وتی کە بە کەسی نەڵێیت، بە چەند کەست وتووە؟

أ- یەك کەس. ب- بە هاوڕێکانم. ج- بە خێزانو هاوکارەکانم.

لە هەڵبژاردنی وەڵامی (أ) (٣) خاڵ، (ب) (٥)خاڵو (ج) ١٠خاڵ بۆ خۆت دابنێ.

* ئەگەر کۆی خاڵەکانت لە ٣٠ خاڵ کەمتر بوو، ئەوا تۆ کەسێکی فزولیو بە قسەو باس نیت، هاوڕێکانت زۆر بە خێرایی متمانەی خۆیانت پێدەبەخشن، متمانەیەکی بەهێزو ستاندار وەردەگریت، هاوڕێکانت دەتوانن ڕازەکانیان لات بدرکێننو دڵنیان لای کەسیتر نایدرکێنیت. تۆ پڕوپاگەندەی جۆراوجۆر سەبارەت بە کەسەکانی دەروبەرتو تەنانەت ئەوانەی کە کەسایەتی دیاریکراویان هەیە دەبیستیو بڵاویشی ناکەیتەوەو گوێشی پێ نادەیت. لەبەرئەوە لە بۆچوونی تۆوە ئەمانە مافی ژیانیان هەیەو دەبێت کەسایەتییەکیان هەبێت. بێگومان هەر کەسێك لە کەسێکی دی جیاوازە.

* بەڵام ئەگەر زیاتر لە ٣٠ خاڵت بە دەستهێنا، ئەوا دەتوانیت چاوێك بە نەریتو هەڵسوکەوتەکانتدا بخشێنیتەوە، تاوەکو ببیتە جێگەی متمانەی هاوڕێو دۆستەکانت.

بەو هیوایەی هەمووان بتوانین نەریتە خراپەکان لە خۆمان دابڕنینو بە نەریتی جوانو ئەرێنی خۆمان بڕازێنینەوە.

سەرچاوە: گۆڤاری خانوادە.



# حیکمەتو ژیریی منداڵێك

و: محەممەد مێرگەیی

لە سەدەکانی ناوەڕاستو لە ناوچەیەکی وڵاتی نەرویجـدا، فەرمانڕەوایەکی دادگەر هەبوو، خاوەنی ڕەوشـتو ڕۆشنبیرییەکی بـەرز بوو، ئـەم فەرمانڕەوایـە کە ناوی (هاکـون) بـوو، ناوچـەو وڵاتەکەی خۆی کردبووە نموونەی خۆشگوزەرانیو ئارامیو ئاسـاییش. (هاکـون)ی فەرمانـڕەوا تاقە کوڕێکـی هەبـوو بە ناوی (کوسـتاف) کە ڕووخسـاری ناشـیرینو باڵای کورتو چاو دەرپەڕیـو بوو، کوڕێکی زیـرەكو لێهاتوو نەبوو، دایکیشـی بەنازپێـدان پەروەردەی کردبـوو. لە کاتێکـدا کـە فەرمانڕەوایی باوکی (کوسـتاف) دەیویست کوڕەکەی بە پەروەردەیەکـی باشو شایسـتە پەروەردە ببێـت، کەچـی دایکـی کوڕەکـە لاوازبوو لـە بەرامبەریدا، هەرگیز هیـچ داوایەکی کوڕەکـەی ڕەتنەدەکردەوەو هەڵسـوکەوتە خراپەکانـی کوڕەکەشـیانی لـە باوکـی دەشاردەوەو نەیدەهێشت پێی بزانێت.

زۆرجاریـش مێردەکـەی پێی دەگوت کە (کوسـتاف) لـە دوای مردنـی دەبێتە جێنشـینو جێگەی مـن دەگرێتەوە، بۆیە ئەگـەر ڕەفتاری باش نەبێتو هەسـت بە بەرپرسـیارێتی نـەکات، ئـەوا متمانەی گـەل لە دەسـتدەدات، کاروبـاری وڵاتیش تێکدەداتو گەل بەرەو لە ناوچوون دەبات، فەرمانڕەوا هەوڵیدا خواریو خێچییەکانی کوڕەکەی ڕاسـتبکاتەوە، بـەڵام نەیتوانی سەربکەوێتو هەر بەو داخو حەسرەتەشەوە کۆچی دوایی کرد.

پـاش ئەوەی (کوسـتاف) دەسـەڵاتو فەرمانڕەوایی کردنی وڵاتی گرتەدەسـت، هاوڕێیەکانی لەخۆی نزیککردەوەو پۆستی بـەرزی بـە هەریەکەیانـدا کە شـایانی ئەو پۆسـتانە نەبوون، ئـەو هاوڕێیانەش پێشـبڕکێیان دەکرد کە خۆیانی لێ نزیك بکەنـەوەو دەستبەسـەر سـۆزی ئـەودا بگرن. تەنانەت خێزانەکەشـی نەیدەوێرا قسـە لـە ئیشـوکارەکانیدا بـکات، ئـەو تەنها بە کچەکەیـان (هورتنس)ی تەمەن شەش سـاڵانو منداڵە یەك سـاڵییەکەیان خەریکبوو.

ڕۆژێکیان، لـە دەرفەتێکدا (هورتنس) چووە ژوورەوەو گوێبیستی ئەو گفتوگۆیانە بوو کە لە دیوەخانی باوکی دەکران، یەکێك بـە باوکی دەگـوت ڕووخسـارت ئەوەندە جوانـە کـە وەك مانگی چـواردە وایە لە شەوی زۆر تاریکدا. یەکێکی تر دەیگوت تۆ بلیمەتی سـەردەمی، ئـەوی تر گۆرانی بە جوانی باڵاو چاوەکانیدا هەڵدەگوت.

(هورتنس) ئەمەی بۆ دایکی گێڕایەوەو لێی پرسـی، ئایا بـە ڕاسـتی باوکی بەو شـێوەیە قۆزو ڕێکوپێكو زیرەکە... هتد؟ دایکیشـی پێکەنیو پێیگوت: ئەی تۆ ڕات چییە؟ کچەکـەش وەڵامیدایـەوە: ئەگەر باوکـم نەبووایە ئەوە بەلامەوە نە جوانو نە باڵاڕێك بوو، نە زیرەکیش بوو!

دایکەکـەش گوتـی: کچەکـەم باوکت ستایشـکردنو پیاداهەڵگوتـن مەسـتی کـردووەو هیـچ لـە زمانـی ئەقڵوهۆش تێناگات. لە کاتی شەودا (هورتنس) بیری لـە ڕێگەیەك کردەوە کـە بتوانێت باوکی بگەڕێنێتەوە سـەر ڕێگای ڕاستو دروست. کە بەیانی بووەوەو دیوەخانی باوکی چۆڵ بوو، (هورتنس) ئاوێنەیەکی بەدەسـتەوە گرتو چـووە لای باوکیو پێیگوت: باوکی خۆشەویستم، ئەم ئاوێنەیە ڕاستگۆترە لە قسەکانی هەموو ئەو خەڵکانەی کە ڕاستی دەشـێوێنن، باوکەکەی سەیری ئاوێنەکەی کردو ئینجا سـەیری کچکەی کردو هیچی نەگـوت. بۆ ڕۆژی دواتر فەرمانڕەوا چاوی بە خەڵكو دەربارەکانی خۆیدا خشاندەوە، ئەوەبوو هەموو خزمەتـکارە درۆزنەکانی وەلانـاو پیاوانـی ژیـرو هۆشـمەند- کە هاوەڵـی باوکـی بـوون- لە خـۆی نزیك کردنـەوە، بەمجـۆرە فەرمانڕەواییەکەی ڕاست کردەوەو شادیو خۆشگوزەرانیش بۆ ناوچەو دەڤەرەکە گەڕایەوە.

سـەرچاوە: گۆڤاری (العربی الصغیر) ژمارە ٢٢٥ — ساڵی ٢٠١١



# وەرزش

ن: عەبدولوەهاب شوانی

نـا نـا نەکـەن، ئـەی مناڵان
یـاری نەکەین، لەپێـش ماڵان
بـا وەرزش کەین، لـە گۆڕەپان
دەستی ڕاستو دەستی چەپمان
یەكو دوو کەین، دەست هەڵبڕین
بڕۆیـن، بازدەین، بـا هەڵفڕین
نا، نـا! نەکـەن، ئـەی مناڵان
بـە پێخاوسـی، نەچنـە کۆڵان
وەرن هەمـوو، بـا ڕابکەیـن
بـۆ خۆشـیمان سـەما بکەین
دەست لە نێو دەست، بخولێینەوە
بـا گۆرانـی، بڵێینـەوە
نـا نـا نەکـەن، ئـەی مناڵان
نا بـۆ وەرزش، نەچنـە کۆڵان
لـە گۆڕەپـان، ڕیز ئەبەستین
دائەنیشـین، جـا هەڵئەسـتین
وەرزش ئەکەیـن، تا پاك ببین
هەتـا چوسـتو چالاك ببین

# ئەڵماس

وەهاب حەسیب محەممەد



بەردەگرانبەهاکان لە ٣ملیار ساڵ پێش ئێستاوە لەسەر زەوی بە قوڵایی ٢٠٠کیلۆمەتر پەیدابوون، پاشان بە هۆی گڕکانەکانەوە کەوتوونەتە سەرزەوی، ٢٠٠٠جۆر لەم بەردانە لە پیشەسازی خۆڕازاندنەوەو خشڵو تەسبیحدا بەکاردێت. هەندێکیان ماتریاڵین وەك: یاقوتو فەیروز، هەندێکی دیکەیان ئەندامین وەك لووئلووئوو کەهرەمانو مەرجان، بەشێك لەو خشڵانە دەگەڕێتەوە بۆ ئەو ژیارانەی کە نەماون وەك ژیاری نێوان هەردوو ڕووباری (دیجلەو فرات)، یان ژیاری فیرعەونەکانو ئەوانی دیکە، لە ڕۆژگاری ئەمڕۆشدا بەشێك لەو خشڵانە بەوە ناسراون کە خانەوادەی پادشاکانو شاژنو شازادەکان بە کاریان هێناون، وەك بنەماڵەی (محەممەد عەلی) لە میسر، یاخود بنەماڵەی پادشا لە بەریتانیا، بەشێوەیەك تاجی شاژنو خشڵەکانی دەگەڕێتەوە بۆ چەرخی حەڤدەیەمی زاینی، کە یەکێك لە گەورەترین پارچە ئەڵماسی لە دنیادا تیادایە.

میسرییە کۆنەکان ٤٠٠٠ ساڵ لەمەوبەر فەیروزو زمورد عەقیقو... هتد، دەرهێناوەو لە بواری ڕازاندنەوەی پەرستگاکانو دارەمەیتی پادشاکانو خۆڕازاندنەوەدا بەکاریان هێناون، لەم بوارەدا گرنگترینیان گەنجینەی(توت عنج ئاموون)ە.

بەردە گرانبەهاکان بەهایەکی māddیان هەبووە، سەرەڕای بەها مەعنەوییەکەی، بەتایبەت لای عەرەبە کۆنەکان، چونکە بەکاریان هێناون لە بواری چارەسەرکردنی نەخۆشیدا، بۆ نموونە لووئلووئیان بەکارهێناوە بۆ بەهێزکردنی دەماری چاوو لێدانی دڵ، یاقوتیان بەکارهێناوە بۆ ئارامکردنەوەی دەروون لە ترسو لەرزو بەدەستهێنانی شانسو شکۆمەندی لە نێوانی خەڵکیداو... هتد.

لە ڕۆژگاری ئەمڕۆشدا سەرەڕای بازرگانیکردن بە ئەڵماسەوە، وەك نیشانەیەکی بازرگانی بەکاردەهێنرێت لە بواری ئابووریدا، بە نموونە لە هەرێمی کوردستاندا کارگەیەکی گەورەی بەرهەمهێنانی چیمەنتۆ لە ناحیەی بازیان (کارگەی ماس) هەڵگری ناوی ئەڵماسە کە لە دوو توێی ناوەکەیدا چەندین ئاماژەو واتای ئەڵماسی لە خۆگرتووە.

## ئەڵماس چییە؟

ئەڵماس بە یەکێك لە گرنگترین شەش بەردە گرانبەهاکان لە جیهاندا دادەنرێت، وەك دیارییەکی بە بایەخ پێشکەش دەکرێت بە هۆی گرانی بەهاکەیەوە، بەتایبەت لە کاتی مارەبڕینو ژنهێناندا، بە ئەڵماس دەگوترێت شای بەردە بەنرخەکان، لەبەرئەوەی بەنرخترینو بەهێزترینو درەوشاوەترینیانە مەبەست لە بەهێزی بەرگەگرتنی بەردی ئەڵماسە بەرانبەر شکاندن لەم بوارەدا لە پێش ئاسنەوەیە.

مێژووی دروستبوونی دەگەڕێتەوە بۆ نزیکەی ٩٩٠ ملێون ساڵ بەر لە ئێستا، لە ژێر پلەی گەرمی ٩٩٠/ ١٣٠٠ پلەی سەدیدا دروست دەبێت، لە کاتی تەقینەوەی گڕکانەکانداو پاش نیشتنەوەی بڵێسەی گڕکانەکان لە زاری گڕکانەکاندا بینراوەو ناسراوە بە (کونی ئەڵماس).

ناوی ئەڵماس لە (ئەداماسی یۆنانییەوە وەرگیراوە)، واتا شتێك کە تێکناشکێت، یان زاڵبوون بەسەریا مەحاڵە، وەك ئاماژەیەك بۆ ڕەقی ئەڵماس مەبەستی ئەو ڕاڤەیەش بەو شێوەیە دەگەڕێتەوە بۆ ڕەقی مادەکەو گرانبەهاییو دەگمەنییەکەی. ئەڵماس بە یەکێك لە ناسراوترینو بەسوودترین ئەو ٣٠٠٠ ماتریاڵە دێتە ئەژمار کە تا ئێستا دۆزراونەتەوە.

## پێکهاتەی ئەڵماس؟

ئەڵماس پێکهاتەیەکی بلوری هەیە زۆربەی کات شێوەی شەش پاڵو دەگرێتە خۆیو هەندێجار شێوەی جیاواز بەشێکی زۆری پێکهاتەکەی بریتییە لە کاربۆن لە ژێر پاڵە پەستۆو گەرمایەکی زۆردا دروست دەبێت سەرەڕای لێچوونێکی زۆر لە نێوان پێکهاتەی ئەڵماسو گرافیتدا، بەڵام هەریەکێکیان خاوەن تایبەتمەندی خۆیەتی ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ تایبەتمەندی پێکهاتەی هەر یەکێکیان، ئەم پێکهاتە کیمیاوییە وایکردووە پاڵ بە زانایانەوە بنێت بۆ گۆڕینی مادەی گرافیت بۆ ئەڵماس کە بە ئەڵماسی دەستکرد (ألماس الصناعی) ناسراوە.

ئەڵماس بە یەکێك لە بەردەگران بەهاکان دادەنرێت کە لە پێکهاتە فیزیاییەکەیاندا گاڵتەیان پێناکرێت، لە ڕاستیدا بەهێزترینو ڕەقترینیانە، ماددەیەکە هەمان پێکهاتەی خەڵوزی بەردی هەیە، بەڵام لە پێکهاتەی ناوەکیدا لەگەڵ ڕەژووی بەردا جیاوازە، چونکە پێکهاتە ناوەکییەکەی بەشێوەیەك پەیوەستە کارێکی کردووە پەیوەندییە کیمیاییەکان لە نێوانی یەکتریدا زۆر بەهێزبن.

## کانی ئەڵماس:

زۆربەی ئەڵماس لە کاتی تەقینەوەی گڕکانەکانەوە کەوتوونەتە سەرزەوی، پاش ئەوەی ماوەی ملیۆنەها ساڵی پێچووە تا لە ژێر پاڵەپەستۆو گەرمایەکی زۆری ناخی زەویدا کە قوڵاییەکەی دەگاتە ١٥٠ کیلۆمەتر پێکهاتەکە شێوەی ئەڵماسی لە خۆگرتووە.

شوێنی ئەڵماس بە گوێرەی کات گۆڕانی بەسەردا هاتووە لە ساڵی ١٣٠٤زاینیدا زۆربەی ئەڵماس لە کانەکانی ئەڵماس لە وڵاتی هندستان دەردەهێنرا، سەرەڕای ئەوە ئەو وڵاتە لەو کاتەدا سەرچاوەی زۆرێك لە بەردە گرانبەهاکان بوو، پاشان لە چەرخی هەژدەهەمدا وڵاتی بەڕازیل لە پێشەوەی ئەو وڵاتانە بوو کە ئەڵماسیان هەناردەی دەرەوە دەکرد. کاتێك ساڵی ١٨٦٠ کانەکانی ئەڵماس لە وڵاتی باشوری ئەفریقیا دۆزرانەوە، ئەو وڵاتە شوێنی بەڕازیلی لەو بوارەدا گرتەوەو ئێستاش زۆربەی کانەکانی ئەڵماس دەکەوێتە وڵاتی باشوری ئەفریقاوە. سەرەڕای ئەوە ساڵانە بڕێکی باش لە وڵاتانی ڕووسیا، کەنەدا، بەڕازیل، ئوستراليا دەردەهێنرێت، کە بڕەکەی ٢٦٠٠٠ کیلۆگرامەو بەهاکەی ٩ملیارد دۆلاری ئەمریکییە، گەورەترین پارچە بەردی ئەڵماس تا ئێستا دۆزرابێتەوە لەسەر ئاستی جیهان لە ساڵی ١٩٠٥دابوو لە کانی **Premier Mine** کە کێشی ٧٥٠گرام (زیاتر لە ٣٠٠٠ قیرات) بوو، لە ڕۆژگاری ئەمڕۆدا ئوستراليا لەسەرووی ئەو وڵاتانەوەیە کە ئەڵماس بەرهەم دەهێنن، پاش ئەو، وڵاتانی: زائیر، بۆتسوانا، ڕووسیا، دواتر باشووری ئەفریقا دێت لەم بوارەدا.

قسەو باسی زۆر لێرەو لەوێ دەربارەی دەرهێنانو دابەشکردنی ئەڵماس دەکرێت، بەتایبەت کرداری (ئەڵماسی خوێناویی) لە لایەن گروپە چەکدارەکانی ئەفریقاوە لە دەرهێنانو بازرگانیکردن بە ئەڵماسەوە، کۆمەڵەی (دی بیریز) کە یەکێکە لە گەورەترین کۆمپانیاکانی ئەڵماس لە جیهانداو بارەگاکەی لە شاری جۆهانسبێرگە، بەوە تاوانباردەکرێت کە لە پێناو دەستبەسەراگرتنو یاریکردن بە نرخی ئەڵماسەوە بڕێکی زۆری ئەو ماتریاڵەیان بۆ خۆیان قۆرخکردووە.

## چاکی ئەڵماس:

هەمیشە باشی ئەڵماس بە چوار پێوانە دێتەپێوانە کردن بریتین لە: قیرات، پاکی (ڕوونی)، ڕەنگ، توانی شکاندن، یاخود کەرتبوون. بەڵام بەرانبەر ئەڵماسی سروشتی ئەڵماسی دەستکرد هەیە کە نزیکەی چوار بەرانبەری ئەڵماسی سروشتی لێبەرهەم دەهێنرێت لەگەڵ ئەوەشدا ئەڵماسی سروشتی قەبارەی بچووکەو تەشویهاتی زۆری پێوەیە وایکردووە نرخی زۆر کەمتربێت لە چاو ئەڵماسی سروشتیدا، ئەڵماسی دەستکرد بەکارهێنانی زیاتر کورت دەبێتەوە لە بواری پیشەسازیدا، لەبەرئەوە هەمیشە بڕوانامەی دڵنیایی لەگەڵ ئەڵماسی سروشتیدا بەکاردەهێنرێت، بەتایبەت لەگەڵ جۆرە دەگمەنەکانیان ئەو بڕوانامانە لە شوێنی تایبەتو پسپۆڕ بەو بوارانەوە دەدرێن کە ئاڵوگۆڕ بە ئەڵماسو بەردە بەنرخەکانەوە دەکەن وەك **Gia** ئەمریکیو **HRD** و **Igi** بەلجیکی کە وردترین باس دەخەنە ڕوو سەبارەت بە پێوانەکانی ئەڵماس، ئەو بڕوانامانە بەشێوەیەك دارێژراونو ڕێکخراون کە کەس توانای گومانی نەبێت لێیان، چونکە لە ڕۆژگاری ئەمڕۆدا بە هۆی لێزەرەوە دروستکردنی ئەڵماسی دەستکردو لێکچوونی لەگەڵ ئەڵماسی سروشتیدا زۆر نزیکە، هاوکات تا ڕادەیەك تێچوونیشی کەمە. باشترین جۆری ئەڵماس ئەوەیە کە لە ناوەڕاستی ئەفریقادا بە هۆی کۆمپانیا بەلجیکییەکانەوە دەردەهێنرێت، کە قۆرخی ئەم بازرگانییەیان لە جیهاندا بۆخۆیان کردووە.

شێوەکانی ئەڵماس: ئەو شێوەیەی ئەڵماسی پێدەناسرێتەوە بریتیە «**Cut**“ واتا شێوەی بڕینیو چەندەها شێوە هەیە لەوانە: مەرکەزیەت، بازنەیی، زومردیو ڕەنگی ئەڵماس سپیو ڕەشەو هەروەها زەردیش لە خۆ دەگرێت.

لە کۆنەوە تا ئێستا ئەڵماس جێگای قسەو باسی زۆر بووە لە نێوان زانایانو بازرگاناندا، ئەوانەی لە ڕۆژگاری کۆندا لەسەر ئەڵماسیان نوسیووەو قسەیان لەسەر کردووە ئیبن سینا، بیرۆنی، کیندیو ... هتد. لە دنیای ئەمڕۆشدا لە هەردوو بواری مادیو مەعنەویدا تادێت بەهای ئەڵماس هەڵدەکشێتو لای بازرگانانو دەوڵەمەندان بەهای لە پێش زێڕەوەیە، چونکە جۆری ئەڵماسەکە تا کۆنتر بێت نرخی گرانترە.

# سەوداگەری و کاریگەری لە فرۆشتندا



ئەسکەندەر ڕەحیم

سەوداگەری، ئەو وتووێژو مامەڵەیەیە، کە لە نێوان کڕیارو فرۆشیاردا ڕوو دەدات، زیرەکیو سەلیقەیی فرۆشیاریش لە سەوداگەریدا دەردەکەوێت.

بە هۆی دارووخانی باری ئابووریشەوە، یان کورتهێنانی داهاتی کڕیارەوە، وایلێهاتووە زۆر بە گران، سەوداگەری ئەنجامی ببێت، زۆرجار کڕیار سەوداو مامەڵە دەکات، دواتریش ئەنجامێکی لێ ناکەوێتەوە.

ئەمەش تەنها گرفتی فرۆشیارێك نییە، بەڵکو زۆربەی فرۆشیاران دەڵێن: ڕێژەی فرۆشی ئێستەمان، لە چاو ساڵانی ڕابردوودا، زۆر دابەزیوە.

لێرەدا چەند خاڵێك دەخەینە ڕوو، بۆ ئەو کاتەی کڕیارو فرۆشیار، دەست بە سەودا دەکەن، پێویستە تۆی بەڕێز بە بایەخەوە لێیان بڕوانیت، ئەوانیش:

**١- بە پێشنیازی یەکەم ڕازی مەبە:**

کاتێك بە کڕیارێك دەڵێیت: ئەو بەرهەمە، یان شمەکە بە ئەوەندە. ئەویش دەڵێت: ئەی بە ئەوەندە نابێت؟ تۆش دەمودەست بەم سەوداگەرییە ڕازی دەبیتو دەڵێیت: بۆ نابێت! ئەم ئاکارە مێشکی کڕیارەکە بە لای دوو شتدا دەبات:

- یان وا دەزانێت لەو قسەیەی کردوویەتی، یان لەو پێشنیازو نرخەی خستوویەتییە ڕوو، پەلەی کردووە. هەر ئەم کارەشی وای لە فرۆشیارەکە کردووە، یەکسەر ڕازی ببێت. ئیدی بە خۆی دەڵێت: دەمتوانی بە خۆگرتنو سەوداگەری زۆرتر، دەسکەوتی باشتر بە دەستبهێنم.

* یاخود کڕیار واگومان دەبات، هەرچەندە فرۆشیار لەسەر ئەو سەودایە دەستبەجێ ڕێکبکەوێت، کە کڕیار لە بنەڕەتدا باوەڕی وانەبووە، بەم ئاسانییە پێی ڕازی ببێت، ئەوا وا هەست دەکات شتێك هەیەو ئەم لێی بێ ئاگایە.

**٢- داوای زۆرتر بکە:**

هێنری کیسنجەر دەڵێت: «نهێنی سەرکەوتن لەسەر مێزی وتووێژ ئەوەیە، گەورەتر لەوەی چاوەڕێی دەکەیت، لە بەرامبەرەکەت داوابکەیت». ئەمە تا ڕادەیەکی زۆر ڕاستە، چونکە لەو بەهایەی کڕیار لە بەرهەمەکە چاوەڕێی دەکات، زۆرتر دەکات. هەروەها لەو خزمەتەش کە هەوڵی بەدەسهێنانی دەدات. ئەمە جگە لەوەی فرۆشیار، زۆربەی ئەو داواکارییانەی لە بەرامبەری ویستووە، بەدەست دەهێنێت.

گەر لە بارێکیشدا کڕیار لە بەرامبەر ئەو نرخەی داوات لێکرد، ڕازی نەبوو، ئەوا تۆی فرۆشیار لە ڕێی سەوداگەرییەوە، دەتوانیت ئەوەی بەڕاستی دەتەوێت، بە دەستی بهێنێت. پێویستیشە لەم قسەیە دەست هەڵبگریت: «نرخەکانمان بەم جۆرەیە، بەس ئا بەم نرخە دەیدەم بە تۆ».. چونکە ئەم قسەیە نرخی شمەكو بەرهەمەکە، یان ئەو خزمەتەی کڕیار بە هیوایەتی، کەم دەکاتەوە.

**٣- لە فرۆشیارانی دیکە جیاواز بە:**

ئەمەش ئەرکێك دەخاتە سەرشانی فرۆشیار، دەبێت تۆی فرۆشیار، سەرودەرێکی باش لەو نرخو شمەکە هاوشێوانەی لە بەردەم کڕیاردایە، بکەیت. مەبەست لەمە ئەو بەرهەمو خزمەتگوزارییانەیە، کە ڕکابەرەکانت برەوی پێ دەدەن. دەشبێت بەدوای هەلی فرۆشتندا، بە بەرزترین نرخ کە دەست بدات، بگەڕێیت. لەبەرئەوە شایستەو پێویستە تۆی فرۆشیار ئەو هەستە لای کڕیار دروست بکەیت، کە ئەو شمەكو بەرهەمانە، یاخود ئەو خزمەتگوزارییانەی تۆ برەویان پێ دەدەیت، گەر بەو بەرهەمە، یان ئەو خزمەتگوزارییانەی کۆمپانیا ڕکابەرەکان برەوی پێ دەدەن، بەراورد بکرێت.. ئەوا ئەمەی تۆ، ناوازەو

بێوێنەیە. پێویستە ئەوەشت لە بیر بێت، کڕیار هەوڵی ڕازیکردنت بەوە دەدات، کە زۆر ڕێو کەسی دیکە هەن، تا ئەم چی بوێت، بە کەمترین نرخ دەستی بکەوێت.

٤- سەرسامی خۆت دروست بکە:

زۆرجار کە فرۆشیار لەگەڵ کڕیاردا، خەریکی سەوداگەرییە، دەکەوێتە ناو هەڵەیەکەوە. ئەویش ئەوەیە، کە سەوداو پێشنیازی کڕیار دەبیستێت، ئەم سەرسام نەبێت، یان سەری نەئاوسێت، چونکە کە کڕیار سەوداو پێشنیازەکەی دەخاتە ڕوو، لای ڕوونە هەرگیز فرۆشیارەکە پەسەندی ناکاتو بەزوویی چەندو چۆنو سەودای لەگەڵدا دەکات. ئەگەر سەرسامی فرۆشیاریشی نەدی، ئەودەم کڕیار ئەو بڕوایەی لا دروست دەبێت.. کە پێشنیازو سەوداکەی تا ڕادەیەکی زۆر پەسەندە. ئەمەش وای لێدەکات، لە کاتی سەوداگەریدا، جڵەوی کاروباری سەوداگەری بەدەستەوە بگرێت.

لەبەرئەوە دەبێت فرۆشیار، فێری ئەوە ببێت کە چۆن لە سەروبەندی سەوداگەریدا، سەرسامی خۆی دروست بکات، چونکە ئەو سەرسامییەی ئەو، هانی دەدا، بە بەرامبەرەکەی شتێکی کەمتر بدات، یان چەند تایبەتمەندییەکی زۆرتر لە پێشنیازو سەودای دەست بکەوێت.

٥- ئاگات لەخۆت بێت، نەکەویتە ناو داوی کڕیاری ڕاڕاوە:

کڕیاری بە ئەزموون، لە سەوداگەریدا شێوازێکی دیاریکراو لەگەڵ فرۆشیاردا بەکار دەهێنێت، تا گوشاری بخاتەسەرو چی بوێت، بە کەمترین نرخ دەستی بکەوێت. ئەویش بە هۆی گرتنە بەری ئەم هەنگاوانەوە:

* کڕیار نرخی چەند شمەکێك دەپرسێتو گوێ بۆ هەموو ئەو نرخانەی تۆی فرۆشیار دەیانخەیتە ڕوو، شل دەکات.. پاشان گشت ئەو پرسیارانەی بە بیریدا دێن، دەیانکات.

* لەسەرئەوەی کاتی خۆت پێ بەخشیوە، کڕیارەکە سوپاست دەکات، پاشان دەڵێت: ئەمە ڕێك ئەو شمەکو بەرهەمانە نییە، کە سەروسۆراغی دەکەم.

* پێش جێهیشتنی فرۆشگەکە، کڕیارەکە لەو شمەکەی خۆی دەیەوێت، لێت دەپرسێت: حەزناکەم بەبێ کڕین، لێرە دەربچم. بە ئەرك نەبێت کەمترین نرخی ئەو شمەکە، کە بۆت دەست دەدات، چەندە؟

بێگومان، زۆربەی فرۆشیارەکان دەکەونە ناو ئەم داوەوەو بڕێکی زۆری نرخەکە دادەبەزێننو چاوپۆشی لێ دەکەن.

٦- شێوازی پێچەوانە بەکاربهێنە:

هەرچی فرۆشیاری سەرکەوتووە، بە باشی گوێ بۆ کڕیار ڕادەگرێتو لەو ڕێیەشەوە دەزانێت ئەو نرخەی کڕیارەکە بە بەرهەمو شمەکەکەی دەدات، چەندە؟ ئیدی فرۆشیارەکە دەڵێت: بە داخەوە، ئەو نرخەی ئێوە دەیڵێن، هەر دەست نادات.

ئەگەر بە پێچەوانەی ئەمەش ڕووی دا.. واتە: گەر لە پێشدا کڕیار گوێی بۆ فرۆشیار ڕاگرتو پاشان لە پێش فرۆشیاردا، لە بارەی باشترین نرخی گونجاوی دەسخستنی ئەو شمەکە پرسیاری کرد. لێرەدا فرۆشیار پێی دەڵێت: ئەو نرخەی تۆ دەتەوێت چەندە؟ یاخود بەڕێزتان چەندی پێ دەدەن؟

٧- چارەسەری سێیەم مەخەرە ڕوو:

واتە: بەر لە کڕیار دەسپێشخەری مەکە، بە جۆرێك بۆ سەربەسەرکردنی سەوداگەرییەکە، زەمینەیەکی هاوبەشی نێوانتان بەدی مەهێنە، بەڵکو هەوڵبدە، هانی کڕیار بدەیت، تا ئەو دەسپێشخەری بکاتو ڕێچارەیەکت بۆ بخاتە ڕوو، کە هەردوولا پێی ڕازی بن. کاتێك کڕیارەکە بەم کارە هەڵدەسێت، سەرەتا دوودڵی خۆت دەربخەو پاشان لە کۆتاییدا ڕازی ببە. ئەم کارە وا دەکات ئەو هەستە لای کڕیارەکە دروست بکەیت، کە ئەو سەرکەوتوو بووەو سەوداگەرییەکەی بردووەتەوە.

٨- بێ بەرامبەر نرخ دامەبەزێنە:

کە کڕیار داوای چەند چاوپۆشییەکت لێ دەکات، یان بڕێك لە نرخەکە دابەزێنیت، یاخود چەند دەسکەوتێکی پێ بدەیت، ئەوا لە بەرامبەر ئەوەدا، شتێك داوا بکە. بۆ نموونە: کاتێك کڕیارەکە داوا دەکات، چەند ڕۆژێك بەر لە وادەی دیاریکراو، بەرهەمو شمەکەکەی بەدەست بگات، ئەوا ئەگەر توانیت، لە ڕازیبوون لاریت نەبێت، گرفتێکیش لەوەدا نییە، کە داوای زۆرترکردنی خەرجییەکانی بارکردن بکەیت، بەڵام نەکەیت ئەم شێوازە، لەگەڵ سەرجەم کڕیارەکاندا، هەروەها لە گشت کارێکی فرۆشتندا، بە کار بهێنیت، چونکە پاڵ بە کڕیارەوە دەنێت، وازت لێ بهێنێت.

سەرچاوە: المختار الإداری: ٩٤.

# چۆن هێمای بازرگانی بە زیندویی دەمێنێتەوە؟

NOKIA

TOYOTA

SAMSUNG

LG

ئەو هێما بازرگانییانەی لەچاو هێما بازرگانییەکانی دیکە، بەهایەکی بەرزتری گەشەونەشەیان هەیە، تا ڕادەی دۆستایەتی، بەکاربەر بۆ لای خۆیان ڕادەکێشن. لێرەدا شەش خاڵ دەخەینە ڕوو، کە پێویستە هەر کۆمپانیایەك خۆیانی پێ بخەملێنن، تا هێما بازرگانییەکەی، بە زیندوویی بمێنێتەوەو بەکاربەر بەرەنگاری نەبێتەوە. ئەو خاڵانەش:

١- دەبێت ئەو کۆمپانیایە، داهێنەرو بوێر بێت، لە هەمان کاتیشدا شادیهێنەر بێتو هەستی ڕەزامەندی بە خەڵکی ببەخشێت.

٢- دەبێت ئەو کۆمپانیایە، لەسەر ڕەوتی ئامانجو بەهاو بۆچوونەکانی بەکاربەر، ڕێ بکات

٣- دەبێت ئەو کۆمپانیایە، بە بەردەمی خۆی نوێ بکاتەوە.

٤- دەبێت ئەو کۆمپانیایە، ناوازەو نایاب بێتو سەرنجی بەکاربەر، بۆ لای خواستە تایبەتییەکانی ڕابکێشێت.

٥- دەبێت ئەو کۆمپانیایە، هانی بەکاربەر بدات، بۆئەوەی ببێت بە دۆستو پشتیوانی.

٦- دەبێت ئەو کۆمپانیایە، لەبەرەو پێشبردنی کلتوورو ئاستی ڕۆشنبیری کۆمەڵگە، یان هەموو جیهان، ڕۆڵ بگێڕێت..

خلاصات: ٤٣١



# مەحموودی موعەززەمی، دامەزرێنەری «مەکتەبی کەمال» بۆ بڕیار دەدوێت..

چاوپێکەوتنی: عومەر موحەممەد سەعید
ئامادەکردنو وەرگێڕانی: سەروەر عومەر

**سەبارەت بە مەحموودی موعەززەمی:**

**«خۆت خۆشبوێتو هاوکاری کەسانی دی بکە، تا ئەوانیش زیاتر خۆیان خۆشبوێت»**

بە قوولی باوەڕی بەم وتەیە هەیەو کردوویەتی بە دروشمی سەرەکی ئەو تێڕوانینەی لە «مەکتەبی کەمال»دا برەوی پێدەدرێت. دەڵێت: کێشەی سەرەکی کۆمەڵگەکان ئەوەیە مرۆڤەکان خۆیان خۆشناوێتو لەگەڵ خۆیاندا ئاشتەوا نین. لەبەرئەوە ئەگەر هەر ئێستا پاکەتێکیان بدەنێو بڵێن خۆشبەختی ئێوە لەناو ئەم پاکەتەدایە، دەڵێن بێگومان هەڵەیەك ڕوویداوەو ئەم پاکەتە هی کەسێکی دیکەیە!

ناوی «مەحموودی موعەززەمی»یە، لەدایکبووی (١٩٥٢ز). ساڵانێکە دانیشتووی کەنەدایە، لەگەڵ هاوسەرو سێ کچەکەی لە شاری ڤانکۆڤەر ژیانێکی بەختەوەرانەی هەیەو بەردەوام لە نێوان ئێرانو کەنەدادا لە هاتوچۆدایە. چەندین بڕوانامەی زانکۆیی هەیەو خولی جۆراوجۆری لە بوارە جیاوازەکاندا بینیوە. تەنانەت ئێستاش بەشێوەیەکی ناوەندی مانگانە هەزار دۆلار لە فێربوونی خۆیدا خەرج دەکات. لەگەڵ ئەمەشدا شانازی ئەو بە بڕوانامەکان، پلە زانستییەکان، زۆری ژمارەیانو ناوبانگی ئەو زانکۆو دامەزراوانەوە نییە کە بڕوانامەی تیادا بەدەستهێناون. ئەو دەڵێت: وایدانێن من کەسێکی نەخوێندەوارم! لە من بپرسن: ئایا بەختەوەریت؟ ئایا لە ژیانت ڕازیت؟ ئەگەر بە دڵنیاییەوە وەڵامی ئەرێنی بدەمەوە، ئەو کات دەتوانیت متمانە بە قسەکانم بکەیتو کاریان لەسەر بکەیت.

مەحموودی موعەززەمی، ساڵانێکە تەواو خۆی بە خۆشبەخت دەزانێت. خۆشبەختی بە تێڕوانینی ئەو، نەبوونی کێشەو نیگەرانی نییە. ئەو هەر ئێستاش لە ژیانیدا لەگەڵ کۆمەڵێك کێشە ڕووبەڕووە، کە ڕەنگە کەسێکی ئاسایی لەپێ بخات. موعەززەمی دەڵێت: تەنها ئەو کەسانە کێشەیان نییە کە ئێستا لە گۆڕستانەکاندا خەوتوون! مرۆڤ تاکاتێك زیندووە، کێشە، یان کێشەگەلێکی هەیە دەبێت چارەسەریان بکات، ژیان واتە ئەمە: چێژ وەرگرتن لە چارەسەری گرفتەکان!

موعەززەمی بەردەوام لێو بە خەندەیە، زۆر ئارامو شادومانەو بە ڕووی کراوەوە لەگەڵ کەسانی دیکە ڕووبەڕوو دەبێتەوە. هەڵبەتە هەمیشە وانەبووە، ڕۆژانێك ئەمیش زۆر تووڕە دەبوو، دەیویست قسەی خۆی بسەپێنێت، شەرمنو کەم متمانەبوو بە خۆی، لەگەڵ ئەوەی لە تاقیکردنەوەی سەر کاغەزدا نمرەی زۆر باشی دەهێنا، لە کاتی تاقیکردنەوەی زارەکی لە پۆلدا دەستوپێی خۆی ون دەکرد. تەنانەت جارێکیان لە ئامادەیی کاتێك نەیتوانیبوو لەسەر تەختە شپرزەییو شەرمنییەکەی کۆنترۆڵ بکات، ئەوەندە توند لەگەڵ مامۆستاکەی قسەی کردبوو لە پۆل کرابوویە دەرەوە. ئەم مرۆڤە شەرمنە ساڵانێکە بۆتە کەسێکی دیکە. چونکە خۆی وای ویستووەو لەم ڕێگەیەدا پێداگرییەکی زۆری هەبووە.

مەحموودی موعەززەمی ئێستا لە سیمینارەکانیدا بەرامبەر سەدان و هەندێجار هەزاران کەس ڕادەوەستێتو بەدڵنیاییەوە پێیان دەڵێت: «دەتوانن ژیانتان باشتر بکەن، دەتوانن ئەو ژیانەی کە پێتان خۆشە دروستی بکەنو دەتوانن خۆتان زیاتر خۆشبوێت!»

ڕووبەڕووی کامێرای تی ڤی دادەنیشێتو بە زەردەخەنەو ئارامییەوە بۆ ملیۆنان بینەر قسە دەکات، کە لە سەرتاسەری جیهاندا بەرنامەکانی ئەو دەبینن. ئەمەو لەگەڵ هەبوونی چالاکی زۆری دیکەدا، زۆربەی کاتەکانی لە «مەکتەبی کەمال»دا خەرجی هاوکاری کەسە ئارەزوومەندەکان دەکات. ساڵی (١٩٩١ز) «مەکتەبی کەمال»ی دامەزراندووەو لە بارەیەوە لە یەك ڕستەدا دەڵێت: «مەکتەبی کەمال تێڕوانینێکە دەتوانێت هاوکاری بکات لە هەر پێگەیەکدا بێت، باشتربێتو خۆشبەخت بێت».

**+ دەکرێت کەمێك سەبارەت بە «مەکتەبی کەمال» قسە بکەیت؟**

= ڕەنگە تەنها شتێك کە نەتوانم کەم لەبارەیەوە قسە بکەم «مەکتەبی کەمال» بێت. «مەکتەبی کەمال» تێڕوانینێکی جیاوازە بۆ مرۆڤو ڕەفتارو ئەندێشەکانی. ئێمە لە «مەکتەبی کەمال» لەو باوەڕەداین زۆربەی مرۆڤەکان لانی کەم ئەمڕۆ دەزانن چی باشەو چی خراپە. بەڵام بەوپەڕی سەرسووڕمانەوە ئەو کارانەی پێویستنو لە بەرژەوەندی ئەواندایە ئەنجامی نادەن. بۆچی؟

بۆ نموونە زۆربەمان دەزانین، یان ئەگەر نەزانین دەتوانین بپرسینو فێر ببین، وەرزشو چالاکییەکانی جەستە، فێربوون، هۆشیاری خواردن، دابینکردنی کاتی تایبەت بۆ خێزانو منداڵەکانمان، پشووی پێویست، پاشەکەوت کردن، سەردانی پزیشك، وریایی سەبارەت بە مادده سڕکەرو زیانبەخشەکان، چ ڕۆڵێکی گرنگیان هەم بۆ تەندروستیو هەم بۆ خۆشبەختیو ئارامی ژیان هەیە. بەڵام چەند کەس کار بەم ئاگاییە ئەرزشمەندانەی خۆی دەکات؟ بۆچی کاری پێناکەن؟

لە «مەکتەبی کەمال»دا، ئێمە لەو باوەڕەداین هۆکارێکی گەورەی ئەوەی کە ئێمە دەزانینو کاری پێناکەین، ئەوەیە بە پێچەوانەی ئەوەی بیری لێدەکەینەوە، «بە ئەندازەی پێویست خۆمان خۆشناوێت»و لەگەڵ خۆماندا ئاشتەوا نین.

ئێمە لە «مەکتەبی کەمال» بە شێوازی سادەو شیاوی جێبەجێکردن سەرەتا نیشانی ئارەزوومەندانی دەدەین کە:

١- ئەوەندەی کە بیری لێدەکەنەوە خۆیان خۆشناوێت. ڕەنگە باشتر بێت بڵێین: زۆربەی کات لەگەڵ خۆیان لە دژایەتیو نکولیدان.

٢- بۆچی خۆیان خۆشناوێت؟

٣- دەتوانین چی بکەینو ڕێگەچارە چییە؟

بۆ کاریگەر بوونو گۆڕینی فێرکردن بە ڕەفتاری ڕۆژانە، شێوازەکانی فێرکردن لە «مەکتەبی کەمال»دا بەسەر سێ ڕێگەدا دابەش دەبێت:

١- فێرکردنی تیۆری کە بە شێوەی سیمینارو خولی ئامادەیی، یان نائامادەیی ساز دەکرێت.

٢- فێرکردن بە شێوەی ۆرك شۆپ، ڕاهێنان لەسەر بەکارهێنانی ئەو خاڵانەی فێری بوون دەکرێت، تا «ئاگایی» بگۆڕێت بۆ «لێهاتوویی».

٣- شوێنکەوتنی ڕێکخراو کە بریتییە لە «پەیوەندییەکی دوولایەنە» تاکەکان بە باوەڕی کەسانی شارەزا، ئەو لێهاتووییانەی فێریبوون بۆ «خوو»، یان «خووی باشی ڕۆژانە»ی خۆیان دەگۆڕن.

لە «مەکتەبی کەمال»دا ڕەفتارە مرۆڤانەکان بەر لەوەی بە کەموکورتی، یان گرێ ئەژمار بکرێن، بە جۆرێك «بەرگری» دەروونی کە بە مەبەستی پاراستنی هاوسەنگی ڕۆحی لە کەسەکەدا بەکاردەهێنرێت، لێکدەدرێتەوە. بە وتەیەکی دیکە، لە «مەکتەبی کەمال»دا کەسەکان بە گشتی بە نەخۆش نایەنە ئەژمار، بەڵکو کەسانێکن بۆ پاراستنی هاوسەنگی دەروونیو کەسێتی خۆیان لە شێوازی پڕتێچوونو بێکەڵك سوود وەردەگرن. هەر بەم هۆیەوە هێندە بەسە لە جیاتی ڕووبەڕووبوونەوە، یا زەبوونکردنی کەسەکان، ئەوان فێری شێوازی کاریگەرترو بەکەڵکتر بکرێن. هەرئەوەندەی کەسەکە باوەڕ بە کاریگەری شێوازە پێشنیازکراوەکە بهێنێت، بەخێرایی دەبێتە مرۆڤێکی باشتر بۆ خۆیو کۆمەلگەکەشی. هەر لەبەر ئەم هۆیەشە تێچوونی گۆڕینی ڕەفتارەکان لە «مەکتەبی کەمال»دا زۆر کەمەو کاتەکەشی هەندێجار زیاتر لە چەند خولەکێك ناخایەنێت.

**+ ئەم زانستەی ئێوە لە بەرنامەو سیمینارەکانتاندا پێشکەشی دەکەن چییەو چ ناوێکی لێدەنێن؟**

- پرسیارێکی زۆر جوانە. لە ڕاستیدا ئەو بابەتانەی پێشکەش دەکرێن لە دوو بەش پێکدێن:

١- یەکەم ناوەرۆك، یان بابەتگەلی فێرکاری کە کۆمەڵەیەکە لە زانستو دۆزینەوە دەروونناسییەکان، ئەزموونی تاکەکەسی، شێوازەکانی خۆناسینی زانستیو زانستە بونیادییەکانی دیکە، وەك فیزیك، کیمیك، بایۆلۆژی...و ئەو جیهان بینییەی لە ئەنجامی بوونە قوتابی مامۆستایانێکی بەڕێزدا، کە هەمبوونو خۆشبەختانە هەموو ڕۆژێك ژمارەیان زیاتر دەبێت، لە مندا دروستبووە.

٢- شێوازی پێشکەشکردنو جێبەجێکردنی ئەو بابەتە فێرکارییانەیە، کە ئەوەش لە لای مامۆستایانێکی بەڕێز لە ئەمریکاو کەنەدا فێربووم. بەم مانایە «فێرکردن کاتێك کاریگەر دەبێت، کە ببێتە هۆی گۆڕان لە ڕەفتاری فێرخوازدا»، ئەگینا تەنها گواستنەوەی ئاگاییو زانست ئەنجامدراوەو ئەنجامە زانستییەکەی زۆر نزمو لە کرداردا کاریگەریی زۆر کەمی دەبێت.

**+ چۆن بتوانین ئامانجێکی گەورەمان لە ژیاندا هەبێت؟**

هەر بەو شێوەیەی لە سیمیناری «ئامانج»دا ڕوونم کردۆتەوە، مرۆڤ بوونەوەرێکە ناتوانێت بێ ئامانج بێت، کەواتە بە ناچاری، یان بۆ ئامانجێك کە خۆی هەڵیبژاردووە، کار دەکات، یان بۆ ئەو ئامانجانەی کە ئەوانی دیکە بۆی دیاری دەکەن. ئەگەر لە خێزانێکدا گەورە نەبووین کە ئۆتۆماتیکی بتوانین ئامانجگەلی بەهادارو گەورەمان هەبێت، پێشنیازی من ئەوەیە: بۆ ژیانتان نموونە، یان نموونەگەلێك هەڵبژێرن. بۆنموونە بۆ کارو کاسبیو کۆکردنەوەی سامان، سەرکەوتنە تاکەکەسی، مەعنەوی، خێزانیو تەندروستییەکانی خۆتان، چەند نموونەیەك هەڵبژێرنو بزانن ئەوان چییان کردووەو چی دەکەن؟ ئەو کات دەبینن چۆن زەینی بە تواناتان دەتانخاتە سەر ڕێگەی بەها مەزنەکانی ژیان. خوێندنەوەی ژیانی کەسە مەزنەکانی مێژووی مرۆڤایەتیش یارمەتیدەرێکی زۆر گەورەی من بووەو هەیە. لەبەرئەوە پێشنیاز دەکەم ژیانی کەسە چارەنووسسازەکان بخوێننەوە، بەدڵنیاییەوە ژیانتان دەگۆڕێتو دەگەنە ئەو باوەڕبەخۆبوونە تەندروستەی کە شایستەی کەسێکی واقیعییە.

خاڵێکی دیکە ئەوەیە لە کەسانی نەرێنیو بۆڵەبۆڵکارو ڕەشبین کە خاوەنی ئامانجی بچووك، یان خراپن، خۆتان بەدوور بگرن. چونکە زۆربەیان نە حەزیان لە پێشکەوتنی خۆیانەو نە ڕێگەش بە پێشکەوتنی ئێوە دەدەن.

**+ هەبوونی ئامانج چ ڕۆڵێکی لە ژیانی مرۆڤدا هەیە؟**

= ڕەنگە باشتربێت لە خۆمان بپرسین، ئایا بە بێ بوونی ئامانجو نەخشەیەکی ڕوونو ئاشکرا دەتوانین بژین؟ لە سیمیناری «ئامانج»دا ئەم پرسیارەی ئێوەم بە نموونەیەکی (ئەلبێرت ئەنیشتاین)، وەڵامداوەتەوە: ئەو دەڵێت مێشکی مرۆڤ وەك پایسکیلێك وایە، تەنها لە دووباردا دەتوانێت هاوسەنگی خۆی بپارێزێت، بە شتێك، یان کەسێکەوە پاڵ بداتەوە، یان بجوڵێت. زەینی مرۆڤ تاکاتێك ئامانجێکی دیاری نەکردبێت بۆ خۆپاراستن لە کەوتن پاڵ بە کەسێك، یان کەسانێکەوە دەداتەوە تا ئەوان ئامانجی بۆ دیاری بکەنو ناچارە کار بۆ ئامانجەکانی ئەوان بکات. مرۆڤی دانا زۆربەی کاتەکانی بۆ ئەو ئامانجەی بە ئاگایانە هەڵیبژاردووە تەرخان دەکاتو هەر بەم هۆیەوە لە ژیانیدا هەم شادومانو سەرکەوتووە، هەم جێگەی ڕێزو خۆشویستنی ئەوانی دیکە.

«ئامانج وەك فانۆسی دەریایی یارمەتیمان دەدات کەشتی ژیانمان لە دەریای زریاناویو شەپۆلاندا ڕێگەی خۆی بدۆزێتەوەو لە نێوان تاشەبەردی کێشەکاندا تێك نەشکێتو نقووم نەبێت»، بە وتەیەکی دیکە، «مرۆڤ بە ئەندازەی ئامانجەکانی گەورە دەبێت».

مرۆڤە مەزنەکان ئەو کەسانەن کە «ئامانجگەل»ی گەورەیان لەسەردایەو بە پێچەوانەی کەسە بچووکەکانەوە کە بە شوێن ئامانجی بچووكو بێبەهاوەن. ئەگەرنا سەرکەوتووترینو کاریگەرترین کەسەکانی مێژوو، هەر هێندەی کەسە داماوو بچووکەکان دەرفەت «تەمەن»یان هەبووە. تەنها جیاوازی گەورەی نێوانیان لە جۆری ئەو ئامانجانەدا بووە کە بۆ خۆیان هەڵبژاردووە.

ئامانج تەنها هۆکارێکە هێزە مەزنە شاراوەکانی ناو مرۆڤ بێدار دەکاتەوەو دەیانخاتە ڕاژەی خودی مرۆڤەوە. ئامانج میکانیزمی مەزنی سەرکەوتن لە مرۆڤدا بە ئاگا دێنێتەوەو دەیخاتە کار. چەند زۆرن ئەو بلیمەتانەی لە ژینگەیەکی بچووکدا بە هەژاریو نەداری ژیان بەسەر دەبەنو چەندە زۆرن ئەو کەسانەی خاوەن ژیریو هۆشێکی ئاساییینو بە هۆی ئامانجە بەهادارەکانیانەوە لە نازونیعمەتدا دەژین.

**+ سەردەمی منداڵی چ ڕۆڵێکی لە ژیانی مرۆڤدا هەیەو چۆن بتوانین کاریگەرییە خراپەکانی ئەم قۆناغە قەرەبوو بکەینەوە؟**

- سەردەمی منداڵی کاتێکە کە یاسای بنەڕەتی ژیانی مرۆڤ تیایدا دروست دەبێتو ڕێکدەخرێت. ئاسایی ئەم فێربوونانە کە دواتر دەبنە سەرمەشقی چالاکیو تێڕوانینو ڕەفتاری مرۆڤەکان لە مامۆستایانێکی وەك، دایكو باوك، مامۆستایانی قوتابخانە، ئەزموونی تاکەکەسی منداڵ و زەمینەی ژینەتیکی کە لەودا هەن، دروست دەبن.

هەر بەوجۆرەی کە یاسای بنەڕەتی وڵاتێك سەرچاوەی تەواوی یاساو دەستووری کارەکانی بەڕێوەبردنی وڵاتەو دیاریکاری جۆری ئاستی ژیانی هاوڵاتیان دەبێت، فێربوونو دۆزینەوەکانی منداڵی دەبێتە سەرچاوەی تەواوی ڕەفتار، گوفتار، تێگەیشتن، هەستو بیرکردنەوەکانی مرۆڤ لە سەردەمی گەورەبووندا. کۆمەلگە خۆشبەختو سەرکەوتووەکان ئەو کۆمەلگەیانەن کە ئاگاداری ئەم قۆناغە چارەنووسسازەنو زۆربەی کاتو تواناو پارەیان بۆ پەروەردەی دروستی منداڵەکانی خۆیان تەرخان دەکەن. هەر لەبەر ئەم هۆیەشە لەو کۆمەلگەیانەدا کە ژنان ڕێزو دڵنیاییەکی زیاتریان هەیە، کەسانی سەرکەوتوو و شادومان زیاترە، تا ئەو کۆمەلگەیانەی هێشتا دەرگیری یاسا سەرەتاییو بێسوودەکانی پەیوەندی نێوان ژنو پیاونو لە تەڵەی باوەڕە هەڵەکانی ئەودا گیریانخواردووە.

ئایندەی کۆمەلگەکان پەیوەندییەکی ڕاستەوخۆی بە جۆری پەروەردەی منداڵەکانییەوە هەیەو ئەمە بە نۆرەی خۆی پەیوەندی بە بارودۆخی ژنانی ئەو کۆمەلگەیەوە هەیە. ڕێزگرتن لە مافی ژنان، واتە هەبوونی ئایندەیەکی ڕۆشنترو نەوەیەکی شادومانترو داهێنەرترو سەربەخۆ تر.



# خەزێنەی خوێندنەوە

زاهیر زانا

خوێندنەوە خۆراکی بیری مرۆڤەو کرداری ڕۆشنەپێکهاتنی ڕۆشنبیریش بەبێ خوێندنەوە زەحمەتەو پێکنایەت، هەروەك چۆن خوێندنەوە دادەنرێت بە یەکێك لە گرنگترین هۆکارەکانی فێربوونی مرۆڤ، کە لە ڕێگەیەوە چەندین زانستو زانیاریو هزری جۆراوجۆر هەڵدەمژێتو دەبێتە هۆی گەشەپێدانی مرۆڤو ئاسۆی فراوانی بۆ دەکاتەوە، دەگێڕنەوە یەکەم کتێبخانە کە فیرعەونەکان دروستیان کرد لەسەر دەرگای کتێبخانەکەیان نوسیبوو: "ئێرە خواردنگەی دەروونو نەخۆشخانەی ژیرییە".

ئێستاشی لەگەڵدا بێت خوێندنەوە سەرەکیترین هۆکاری گواستنەوەی بەرهەمی عەقڵی مرۆڤو ئادابو هونەرو داهێنانەکانە. سەیر لەوەدایە وەکو پێویست قەدری ئەم بەخششەمان نەگرتووە، بۆ نموونە ئەگەر بڵێین دەوڵەمەندێك سەروەتەکەی خۆیو ئەوەی چەند ساڵە کۆی کردۆتەوە دەیبەخشێت، ئەوا گومانی تیانییە کە شەقامەکان لەبەر قەرەباڵغی جمەیان دێ، هەرکەسەو پەلەیەتی بەڵکو بەشێك لەو سەروەتەی بەربکەوێت، بەڵام کەم نین ئەوانەی کە سوود لە بەخشینی نووسەران وەرناگرن، نووسەرانو زاناکان ئەوەی هەوڵی بۆ دەدەنو شەونخوونی لە پێناودا دەکەن، دەیبەخشن.. کەچی ئێمە بە بایەخەوە سەیری ناکەینو باوەشی بۆناکەینەوە، مەگەر لە خۆتان پرسیوە کام سەروەت هەمیشەییە؟ ناوی دەوڵەمەندەکانی سەردەمی ئەفلاتۆن مانەوە، یان ناوی ئەو؟ ناوی شکسپیر مایەوە، یان ناوی بازرگانەکان! ناوی ئیبن خەلدون مایەوە، یان ناوی زێڕەنگەرەکانی سەردەمەکەی! ئەرێ یەکەم وشە کە جوبرەئیل (سەلامی خودای لێبێت) بە پێغەمبەری ئیسلامی فەرموو: (سەلامی خوای لێبێت) "اقرأ" نەبوو!!!

لەسەردەمی نوێشماندا خوێندنەوە یەکێکە لە چالاکییە ڕۆژانەییەکان، چونکە تاکە ڕێگای داهێنانو بنیادنانی داهێنەرو بیرمەندو ئەدیبەکانە.

بەڵێ گەلی خوێنەر گەلی نوێنەرە! خوێنەرەکان ئازادەکانن، چونکە لە ڕێگەی کتێبەوە بۆ هەر کوێیەك بیانەوێت گەشت دەکەنو لە کۆیلایەتیو نەزانین ڕزگاریان دەبێت، ئەوان هەرچی بیانەوێت بە دەستی دەهێنن بەبێ پاسپۆرتو بازگەو خاڵی پشکنین.

مرۆڤی خوێنەر شکستو هەزیمەتی سەختەو خۆڕاگرو بەهێزە لە بەردەم ئەزمەو پەستانو نارەحەتییەکانداو توانای هەڵگرتنی بەرپرسیارێتی هەیەو تێگەیشتنی بۆ شتەکان فراوانترە.

بخوێنەرەوەو وەڵامی پرسیارەکان لە دووتوێی لاپەڕەکاندا بدۆزەرەوە، کاتێك کتێبەکان دەکەیتەوە دەرگاکان دەکرێنەوەو خەزێنەی پڕ فەڕو بەرەکەتی دانایت بۆ دەخەنە سەرپشت، هەروەك لە ڕێگەی خوێندنەوەوە دەتوانیت هەزاران ساڵ بژی تەنها لە ڕێگەی ژیانێکەوە، چونکە تەنیا ژیانێك بەس نییە، یان وەکو عەباس مەحمود عەقاد دەڵێت: "خوێندنەوە چەندین تەمەنی تر بۆ تەمەنی مرۆڤ زیاد دەکات"!

لە ڕێگەی خوێندنەوەوە دەتوانیت لەگەڵ کریستۆفەر کۆلۆمبس، ئەمریکا بدۆزیتەوەو لەگەڵ ئەدیسۆن لە تاقیگەکەیدا کاربکەیت، زۆر ئاسانە دەتوانیت لەگەڵ قازیو شێخی مەحمود نەخشەی سەربەخۆیی کوردستان دابنێیتو شۆڕش بکەیتو لە خزمەت مەحویشدا لە خانەقاکەیدا ئەدەبو شیعرو عیرفان فێربیت.

تەنها بە هۆی کتێبو خوێندنەوەوە دەتوانیت خێراییو لەشسوکی تەواوی مێژووی جیهان بگەڕێیت، دەتوانیت سەیری بنیادنانو ڕووخانی شارستانییەتو دەوڵەتەکان بکەیت، دەتوانیت لە مەزنی شاعیرەکانو حیکمەتی فەیلەسوفەکانو ئەنجامی توێژینەوەکان سوودمەند بیت.

هیچ سەخت نییە بچیتەوە ئەسینای کۆنو ڕووخساری سوقرات ببینیو لەگەڵ ئیبن بەتوتە سەرقاڵی گەشتو گەڕان بیت، دەتوانیت لەگەڵ تاریقی بن زیاد بچیتە ئەوروپاو سەیری کەشخەیی ئەندەلوس بکەی.

خوێندنەوە ئەو شەرەفەت پێ دەدات کە لەگەڵ مۆنتیسکۆو ڕۆسۆو ئەوانیتردا گفتوگۆبکەیتو تەنانەت ڕەخنەشیان لێ بگریو شان بەشانی شۆڕشگێڕانیش بەندیخانەی باستیل بشکێنیو بەپێی پەتیو بەچڵێك دار زەیتونەوە لەگەڵ گاندی مرۆڤ دۆستو شۆڕشگێڕدا دژی داگیرکەر بووەستیتەوە!

بە هاوڕێیەتی کتێب ئەمڕۆت دەست پێ بکە تائێوارەت لێ بێت، وەك بیرمەندێکی گەورە! چونکە کتێب زانیاری نەبڕاوەو لە بن نەهاتووی مرۆڤایەتیت پێدەبەخشێت!

هەر لە ڕێگەی خوێندنەوەوە دەتوانیت لەگەڵ ئەو بیرمەندانەدا پیاسە بکەیت کە هەزاران ساڵە لە ژیان دەرچوون، مەترسە لەگەڵ زاناکان بچۆرە کەشکەلانی فەلەکو قوڵایی دەریاو زەریاکانەوە.

ماڵەکەتو شوێنی کارەکەت بە کتێب بڕازێنەرەوەو بۆنخۆشی بکە، چونکە بە هاوڕێیەتی کتێب دەتوانی لەگەڵ ژیانو دنیا بسازێیت، لەبەرئەوەی کتێب پردی پەیوەندی نێوان ڕابردوو ئێستاو داهاتووە، بخوێنەرەوە، دڵنیام بەهەشتیش کە بێ کتێبو کتێبخانە نییە!



# ئێمەو کەلتوری ڕۆژئاوا

دیمەن حەیدەر

هەمیشە واڕاهاتووین، کە سەرسام بین بە زۆرینەی کەلتورە جۆراوجۆرەکان، جگە لە کەلتوری وڵاتی خۆمان، بە شێوەیەك سنوری سەرسامی دەبڕێتو دەچێتە قاڵبی شوێنکەوتنو لاساییکردنەوە، مانەوە لە سنوری سەرسامیدا لە زۆرکاتدا کێشەیەکی وا دروست ناکات، بەڵام کێشەکە کاتێك دروست دەبێت کە بچێتە چوارچێوەی لاساییکردنەوەو جێبەجێکردن، بێئەوەی بیر لە لایەنە چاكو خراپەکانی بکەینەوە، ڕاستەوخۆ بە چاوداخراوی هەمان ئەو ڕەفتارو دیاردانەی ئەوان دووبارە دەکەینەوە، جا بینینیان لە ڕێگەی کەناڵو زنجیرە تەلەفزیۆنییەکانەوە بێت، یان لە ڕێگەی تۆڕەکانی ئینتەرنێتەوە.

دەتوانم بڵێم: کە ئێمە نێچیرێکی زۆر سادەین بە دەست کەلتورە نامۆو بێگانەکان بە وڵاتی خۆمان، بە تایبەتی کەلتوری ڕۆژئاوا.

بۆیە دەڵێم: ئەوەندەی وەرگرو قبوڵکەری ڕەفتارو کەلتورە نێگەتیفەکانیانین، بەداخەوە شتە باشەکانیان وەرناگرینو نایانبینین!

بەمشێوەیە دەبینە هاوبەشو پشتگیری شکستەکانیان نەك پێشکەوتنەکانیان، لەبەرئەوە شکستپێهێنانی ئێمە، سەرکەوتنی ئەوانە بەسەرمانداو لە بەرامبەردا دۆڕانی خۆمانە.

دەبینی زۆر بە ئاسانی بە شانازییەوە سەلامی پڕ لە بەرەکەتی لای خۆمان دەگۆڕین بە (های)، زۆر بە سانایی مۆدێلی جلوبەرگە سەیروسەمەرەکانیان کە نامۆن بە ئاینو کەلتوری ئەم وڵاتە، قبوڵ دەکەینو لامان ئاساییە، کەچی زۆرجار بەکارهێنانی وشەو کەلتورە ڕەسەنەکانی خۆمانمان لێدەبێت بە عەیبە!

ستایلو شێوازی ئەوان وەردەگرینو پەیڕەوی دەکەین، شانازی بە ڕاگرتنو بە خێوکردنی سەگ لە ناوماڵەکانماندا دەکەین، تەنها لەبەرئەوەی لای ئەوان شتێکی باوەو منداڵەکانیان زیاتر بایەخی پێدەدەنو نرخی مرۆڤی دەدەنێ!

بێئەوەی بزانینو لێی بکۆڵینەوە کە ئایا ئەمانە چینو بنەڕەتو ناوەرۆکیان لە چییەوە سەرچاوەی گرتووە؟!

بیرمان دەچێت کە ئەوان لە ژینگەو کەلتورێکی زۆر نامۆ بە وڵاتو دینی ئێمە دەژینو گیرۆدەی دەستی ئەو ئاکارو ڕەفتارە بێ ئامانجانەیانن، ئێمە بەم کارەمان دەبینە بازاڕێکی چالاكو گوێڕایەڵ بۆ نمایشکردنو ساغکردنەوەی زۆرینەی کەلتورە نامۆو نەرێنییە جۆراو جۆرەکان، بۆیە نابێت ئێمە هەروا بە ئاسانیو شلگیرانە ڕێچکەی خۆمان بەربدەینو سەر بەرێگەیەکی نەناسراوو متمانە پێنەکراودا بکەین.

ئایا تا ئێستا هەوڵمانداوەو توانیومانە کە ئێمە ئەوان ناچار بە قبوڵکردنو پەیڕەوکردنی کەلتوری خۆمان بکەین؟

بێگومان نەخێر، چونکە ئەوان هەرگیز ناتوانن بە ئاسانی کەلتورێکی نامۆ بە وڵاتی خۆیان بێئەوەی لێی بکۆڵنەوەو بزانن چییەو چۆنە قبوڵ بکەن، پشت لە کەلتوری چەند ساڵەی خۆیان بکەن، چونکە لە بنەڕەتەوە وا پەروەردە کراون کە زۆر دڵسۆز بن، بۆ دینو کەلتوری وڵاتەکەیان!

کەواتە بۆ دەبێت ئێمە ئەوەندە سادەبین، لە کاتێکدا بەشێکی زۆری کەلتورمان لە دینەکەمانەوە سەرچاوەی گرتووە، کە ڕاسترینو سەرکەوتووترین ڕێبازە بۆ پەیڕەو کردن لە ژیاندا!

یەکێك لەو کەلتورە نامۆو نەرێنیانەی کە دزەی کردووەتە نێو کۆمەڵگەکەمان (تاتۆیە)، کە بەداخەوە زۆرێك لە گەنجەکانمانی سەرقاڵ کردووە، دووچاری زیانی گەورەی کردوون.

ئەوەی مەبەستمە لێرەدا بیخەمە ڕوو زیانەکانی کێشانی (تاتۆ)یە:

١- کێشانو هەڵکۆڵینی تاتۆ لەسەر پێست، دەبێتە هۆی دروستبوونی برین ئەگەر بخورێنرێت.

٢- بوونی حەساسییەت بەو ماددە کانزاییانەی بۆ کێشانی تاتۆ بەکاردەهێنرێت.

٣- دەبێتە هۆی گواستنەوەی ئەو نەخۆشییانەی کە دەگوازرێنەوە.

٤- هەوکردنی پێستو دروستبوونی دوومەڵو برین.

٥- هەوکردنی بۆری خوێن لە ڕووکەشی سەرەوەی پێست.

٦- نۆ جار ئەگەری تووشبوونی زیاتر دەبێت لە کەسانی ئاسایی بە ڤایرۆسی جگەر لە جۆری (C).

٧- لە کاتی گرتنی تیشکی (mri) لە کەسی تاتۆ بۆ کێشراودا، تووشی کێشە دەبێتو ئەگەری ئەوەی هەیە، شوێنی تاتۆکە سوور بێتەوەو بئاوسێت، وەك سووتاویی لێدێت.

٩- ژەهراویبوونی خوێن.

١٠- بەرزبوونەوەو هەڵتۆقانو هەڵئاوسانی شوێنی دەرزی ئاژنەکە، بەسەر لێوارە تەنیشتەکانیدا لە هەندێ کەسدا.

هەروەها ئێستا لە ئەمەریکا ئەو کەسانەی تاتۆ دەکێشن، تا یەك ساڵ ڕێگەیان پێنادرێت خوێن ببەخشن، لە ترسی گواستنەوەی نەخۆشی.

١١- ئەمە جگە لەوەی کە ئەو کەسانەی تاتۆ دەکێشن خاوەن کەسایەتییەکی ڕووخاون لەڕووی دەروونییەوەو هەمیشە ناجێگیرن، چونکە بە تەنها کێشانی تاتۆیەك ناتوانن قەناعەت بهێنن، بەڵکو چەندین جار دەیکوژێننەوەو تاتۆی وێنەی نوێ دەکێشن، زۆرینەی ئەو وێنانەی کەدەیکێشن لەسەر جەستەیان تەعبیرێکی سەلبی دەنوێنن، بۆ نموونە وێنەی کەسایەتییە شەڕەنگێزەکان و سەرنەکەوتووەکان، یاخود وێنەی گیانداری زیانبەخش وەکو دووپشك و مار.

پێغەمبەر (سەلامی خوای لێبێت) لەعنەت دەکات لەوەی خاڵ دەکوتێت، لەوەش کە بۆی دەکوتێت، لەبەرئەوەی دەستکاریکردنی دروستکراوی پاك و بێگەردی خودایەو زیان پێگەیاندنی ئەو بەخششەیە.

ئەمانە تەنها زیانی یەك لەو کەلتورانەیە کە هاتۆتە کۆمەڵگەی ئێمەوە، ئەمەو هەموو ئەو ڕەفتارو دیاردە نەرێنیانەی تر کە ملکەچیان دەبین، هەریەکەیان بۆ خۆی چەندین زیانی تەندروستی و کەلتوری و کۆمەڵایەتی لێ دەکەوێتەوەو ناسنامەی ڕەسەنی خۆمانمان لێ وەردەگرێتەوە.

بۆیە دەتوانین لە بری وەرگرتنی دیاردە نەرێنییەکانیان چەندین بیرۆکەی باشو بنیاتنەریان لێوەرگرین، دەتوانین لە داهێنانە زەبەلاحو تواناکانیان،لە کارکردنو ماندوونەبوونیاندا چاویان لێ بکەین، بەڵام ئەوەی باسمان کرد نەك تەنها پێشکەوتن نییە، بەڵکو چەندەها هەنگاو بەرەو دواوەمان دەگەڕێنێتەوە.

بۆیە دەکرێتو دەتوانین لەتەماشاکردنی هەڵەکانی ئەوان پەند وەربگرین، تادەگاتە ئەو ڕاددەیەی باوەش بەبەهاو ڕەوشتە باڵاکانی خۆماندا دەکەینو لە لەدەستدان دەیانپارێزین.

و: شڤان گۆران

# ٧ ئامۆژگاری بەسوود، بۆ زیادکردنی بڕوابەخۆبوون



١- ئەم پرسیارە زۆر جار لە خۆت بکە، " خراپترین شت کە لەوانەیە ڕوویدات چییە؟" ئێمە گرنگی زیادو لە ڕادەبەدەر بەو کێشانە دەدەین کە تەنها لەوانەیە ڕوویدەن. هەموومان بڕی پێویستو دیاریکراوی خۆمان لە وزە هەیە، بۆیە با لە دروستکردنی پەیوەندییە سەیرو کەم وێنەکاندا بەکاری بێنین، لە بەرەوپێشبردنی ژیانی پیشەییو گەیشتنمان بە ئامانجەکان بەکاری بێنین، لە جیاتی لە دەستدانو بەفیڕۆدانی ئەم وزەیە، لە نیگەرانیو بێزاریدا. کارێك بکە بۆ ئەو شتانەی کە کۆنتڕۆڵت لەسەریانەو مەترسی ئەو شتانەش کەم بکەرەوە کە کۆنتڕۆڵت بەسەریاندا نییە. پاشان ژیرانەو بە حیکمەتەوە وزەکەت وەگەڕبخەو بیخەرە کار.

٢- لە ئەنجامدانی شتێك بۆ یەکەمجار، وابێنە بەرچاوت کە ئەم شتەت پێشتر لە ڕابردوودا ئەنجامداوە، چاوەکانت بگرە، پاشان بە هەستێکی بەهێزو قووڵەوە سەرکەوتنت بێنەرە بەرچاو لەو شتەی کەوا بە نیازیت بۆ جاری یەکەم ئەنجامی بدەیت. مێشك ناتوانێت جیاوازی بکات لە نێوان شتێك کە بە هەستێکی بەهێز هێنرابێتە بەرچاو (خەیاڵکرد)و شتێکی ڕاستەقینە. بە بەکارهێنانی هەر پێنج هەستەکانت ئەو شتە بکە بە شتێکی چالاكو زیندوو.

٣- کەسێك بدۆزەرەوە لە نزیك خۆت کە بڕوای بەخۆی بێتو کۆپی ئەو هەڵسوکەوتەی بکە. ئەوەندەی دەتوانیت بە دوای ڕەفتارو هەڵوێستو بەهاو بیروباوەڕەکانیان بکەوە لە حاڵەتێکدا کە دەتەوێت بڕوات بە خۆت بێت. چۆن دەتوانیت ئەمە بکەیت؟ ئەگەر پەیوەندیت لەگەڵیاندا هەیە دەتوانیت قسەیان لەگەڵدا بکەیت. ئەگەرنا ئەوا پەیوەندییان لەگەڵدا ببەستە، ئەوەندەی دەتوانیت سوودیان لێ وەربگرە. ئەمە لەو حاڵەتەشدا دەکرێت ئەگەر قسە لەگەڵ ئەو کەسانە بکەیت کە کەسەکە دەناسن.

٤- ڕێسای " ئەگەر" بەکاربێنە، من زۆر ئەم ڕێسایەم خۆشدەوێت. ئەگەر بڕوات بەخۆت بێت، هەڵسوکەوتت چۆن دەبێت؟ چۆن دەجووڵێیتەوە؟ چۆن قسە دەکەیت؟ بیر لە چی دەکەیتەوە؟ لە ناخەوە چی بەخۆت دەڵێیت؟ بە ئاڕاستەکردنی ئەم پرسیارانە لە خۆت، تۆ هاندەدرێیت بۆ وەڵامدانەوەیان بە چوونە سەر باری بڕوا بەخۆبوون. ئەو کاتەش تۆ کارت بە ڕێسای "ئەگەر" کردووە. ئێستا لە بیری بکە کە ئەم شتە تەنها نوواندنە، لە کاتێکی زوودا پەرەی پێ دەدەیتو دەبێتە نەریتێکی ڕۆژانە.

٥- بڕۆ بۆ ناو داهاتوو، پرسیار بکە ئەگەر ڕووبەڕووی مەسەلەیەکی وا گەورە ببیتەوە. ئەمە لەوانەیە تا ڕادەیەك ڕەشبینانە بێت، بەڵام زۆر بە باشی کار دەکات. بێنە بەرچاوت کە لەسەر تەختی مردندایتو سەیری دواوەی ژیانت دەکەیت. هاوڕێو ئەندامانی خێزانەکەت لە دەورتدا کۆبوونەتەوەو خەریکی پێداچوونەوەیەك بە ژیانی ڕابردووتدا دەکەیت. ئایا ئەو شتانەی ڕووبەڕووی بوویتەوە ئێستا دەردەکەوێت؟ ئەمە تاڕادەیەکی زۆر دوورە لە ڕوودان. هێشتنەوەی شتەکان لە دیدگای دروستەوە بەڕاستی ترس کەم دەکاتەوە.

٦- لە یادت بێت کە ١٠٠٪ ئەو هەلانە دەدۆڕێنیت کە هەرگیز هەوڵ نادەیت بەدەستیان بێنیت. بۆ بەدەستهێنانی ئەو شتانەی دەتەوێت، بەدوایاندا بگەڕێ. بڕوای تەواوم هەیە کە ئەگەر پرسیاری ژمارەیەکی پێویستی خەڵك بکەم لە هەر شتێك کە بمەوێت بە دەستی بێنم، دەتوانم بە دەستی بێنم. ئەمە هەموو کاتێك ڕاست نییە، بەڵام خۆ بیرۆکەیەکی باشە. کاتێك بیر لە ئامانجەکانتو ئەوەی لە پێناویدا تێدەکۆشیت دەکەیتەوە، چەندە کاریگەری بەسەرتەوە دەبێت لە کاتێکدا ئەگەر بڕوات بە خۆت هێنا کە هەموو خەڵکی ئەوێ دەیانەوێت یارمەتیت بدەن، تەنها ئەگەر تۆ داوایان لێ بکەیت؟ هەرچەند ئەمە ڕاست بێت، یان نا، لە "جیهانی ڕاستەقینە"دا، ئەوا کێشە نییە. ئەگەر بینیت ئەم بیروبۆچوونە هێزو وزەت پێدەبەخشێت، ئەوا داوات لێدەکەم کە بەکاری بهێنیت.

٧- "ئەو دەنگە بێزارکەرو ڕەخنەگرە نەرێنییەی ناوخۆت لە کار بخە، ئەم دەنگە نەرێنییە ناوخۆییە دەتوانێت هەموو کەسێك ڕابگرێتو بیوەستێنیت. بۆئەوەی دەنگە ناوخۆییەکەت لە کاربخەیت، کۆنتڕۆڵی دەنگ بێنەبەرچاوی خۆتو دەنگەکە کز بکە. یان چۆنە ئەگەر دەنگە ناوخۆییەکە بگۆڕیت بۆ دەنگی میکی ماوس؟ پێت وایە ئەگەر میکی ماوس ڕەخنەت لێ بگرێت، ئەوا بە جدی لێی وەردەگریت؟ دەنگەکە بگۆڕە بۆ دەنگێکی گاڵتەئامێز. خاڵەکە لەوەدایە کە دەنگەکە لە کاربخەیت، بە گۆڕینی ئەو ڕێگەیەی کە ڕەخنەت لێ دەگرێت. ئەگەر گوێم لە دەنگی خۆم بێت ڕەخنەم لێ دەگرێت، دەموەستێنێت. ئەگەر گوێم لە دەنگێکی گاڵتەجاڕیو گاڵتەئامێز بێت، ئەوا پێدەکەنمو بەردەوام دەبم بەرەو پێشەوە.

سەرچاوە:

www.selfgrowth.com



ن: جونەیر سوعەوی
و:ئەحمەد بەدرەدین

# دوای چل ساڵ وەستایی تازە بووەتەوە بە شاگرد

هەمووومان دەزانین، گەر کەسێك چل ساڵ كارێك بكات، ئەوا دەبێتە كەسێكی شارەزا لەو كارەیدا، بەڵام ئەگەر دوای ئەو هەموو ماوەیە كە تەمەنێكە ببیتەوە بە شاگرد؟ با بزانین چۆن؟ دەگێڕێتەوەو دەڵێت: كە ئەو ڤاتەی كە تازە كڕیبووم كردمە بەرەو جانتاكەشم كە هەمان ڕەنگی هەبوو، هەڵگرتو بۆ یەكەم وانەم لە كۆلێژ كەوتمەڕێ، كاتێك كە بەرەو ئەو گەراجە دەڕۆیشتم كە ئۆتۆمبێلەكەم لێ ڕاگرتبوو، ئەوەندەم زانی خۆم لەسەر زەوییەكە بینییەوە، وادیارە كەمێك لە خۆبایی بووەو بەرزاییەكەی پێش خۆمم نەبینی بوو، سەر ئەژنۆی پانتۆڵەكەم دڕاو ناو لەپی چەپم بە خراپی بریندار بوو، یەكسەر خۆم كۆ كردەوەو بە جانتاكەم دڕاوی پانتۆڵەكەم داپۆشیو گەڕامەوە ماڵەوە.

دواتر پانتۆڵەكەم برد بۆ لای بەرگدروییەك، لەو نێوانەدا ئەوەی بەسەرم هات بۆم گێڕایەوەو برینەكەی ناو لەپیشم پێ نیشان دا، بەرگدرووەكە كە كابرایەكی بەساڵاچوو بوو، چاویلكەكەی لە چاو كرد، یەكەمجار سەیرێكی برینەكەی ناو دەستمی كردو پاشان سەیری دڕاوی پانتۆڵەكەی كردو وتی: سەری هەفتە وەرەوە كوڕی خۆم، بەرلەوە پێم تەواو ناكرێت، منیش لەبەرئەوەی فرە سەرقاڵ بووم تا دوای مانگێك نەمتوانی بچمەوە، پاش چوونەوەم بینیم پانتۆڵەكەی چاكردبوووەوەو خستبوویە سەر ڕەفەیەك، كە دەستی بۆی برد دای بگرێ وتی: قوماشەكەی زۆر جیابوو، زۆر خەریكی كردم، نرخەكەشیم لەسەر نووسیووە. كە سەیری كاغەزەكەم كرد زۆر سەرم سوڕماو پرسیم: ئەرێ ئەو نرخە زۆر نییە؟ خۆ ئەو شوێنەی چاكت كردووەتەوە ئاسەواری دڕاوەكەشی زۆر پێوە دیارە!! پێدەچوو زۆر توڕەم كردبێت، چاویلكەكەی لە چاوی كردەوەو وتی: سەیركە كوڕم: ئەوە چل ساڵە خەریكی ئەم پیشەیەم، ئەگەر دەتوانیت پیشەوەرێكی تر بدۆزیتەوە كە لە من باشتر بێت، ئەوا ڤرۆشێك چییە لێت وەرناگرم!

بۆئەوەی چیتر بەرگدرووی بەساڵاچوو توڕە نەكەم، بڕیارم دا چیتر قسە نەكەم، دەستم بۆ باخەڵم بردو كاتێك پارەكان بەر ئەو شوێنەی دەستم كەوتن كە بەر لە چەند هەفتەیەك پێشتر بریندار ببوو، بەڵام ئێستا بە تەواوی چاك ببووەوە، وەك بڵێی بریسكێ دای لە مێشكم هاوارم كرد: دۆزیمەوە، ئەو پیشەوەرە بە توانایەی كە باست كرد دۆزیمەوە، سەیر كە، لەو كەوتنەی كە بۆم باس كردبوویت، كە لەگەڵ دڕانی پانتۆڵەكەما ئەو دەستەشم هەڵدڕابوو، كەواتە سەیركەو بزانە هیچ ئاسەوارێكی ئەو هەڵدڕانە ماوە؟ پیرەمێردەكە سڕبوو، سەیری ناو دەستی دەكردم، هەستم كرد كەوا لێوەكانی دەلەرزن‌و چاوەكانی پڕبوون لە ئەسرین، بە پچڕپچڕەوە وتی: ڕاست دەكەیت كوڕەكەم!! زۆریش ڕاست دەكەیت، لەگەڵ ئەوەشدا كە تەمەنی خۆم لەسەر ئەو پیشەیە داناوە، بەڵام تا ئێستا پەیم بەو گەورە پیشەوەرە نەبردووە، لە كۆتاییدا زۆر بە زەحمەت توانیم وا لە كابرای بەساڵاچوو بكەم، هیچ نەبێت كەمێك پارەم لێ وەربگرێت، لەوە بەدواوە زوو زوو سەرم لێ دەداو لە حاڵ‌و ئەحواڵ‌و گوزەرانیم دەپرسی‌و زۆر خۆشحاڵبوو بەوەی كەوا گەر لە كۆتایی تەمەنیشیدا بێت گەورە پیشەوەرێكی دۆزیوەتەوەو دەیگوت: (دوای چل ساڵ وەستایی بوومەوە بە شاگرد)، لە كۆتاییدا دەمەوێت ئەوە بڵێم كەوا با هەمووومان ئاگامان لەوە بێت كە تا شارەزابین لە بوارێكاو بەناوبانگ بین، ئاگامان لەوە بێت كەوا لەخۆمان بەرزترو بە تواناتر هەیە، كە ئەویش خوا گیانەو هیچ كات خۆمان بە گەورە نەزانین.




کارزان ڕەشید

# ئومێد بۆ مرۆڤ، هێندەی باڵ بۆ باڵندەکان گرنگە!

ئێمەی مرۆڤ بۆئەوەی بە ئاواتەکانمان بگەین، پێویستمان بە ئومێد هەیە، چونکە ئومێد کۆڵەکەی ژیانە، وەك چۆن باڵ بۆ باڵندەکان پێویستە، ئاواش ئومێد بۆ مرۆڤەکان پێویستە، هەموو کەسێك لە ئێمە دەتوانێت ئەو ئومێدەی کە هەیەتی بە هۆی خۆڕاگریو باوەڕبەخۆبوونەوە بیهێنێتە دی. هەرگیز نابێت ئێمەی مرۆڤ نائومێد بین لە ژیان، چونکە واڕوویداوە دواهەمین کلیل لە ناو کۆمەڵێك کلیلدا دەرگای داخراومان لێ بکاتەوە. بۆیە لەم چیرۆکەوە فێر دەبین، ئەگەر بتوانیت خۆت وابببینیت کە بە ئامانجەکانت گەیشتوویت ئەوا نیوەی ڕێگەکەت بڕیوە.

**ئەگەر مرۆڤێکی شەل نەبێت، بە پاڵەوانی ڕاکردن، تاوانبار خودی خۆیەتی!**

(سەرکەوتن، ئەنجامی من دەتوانمەکانە)

چەند ساڵێك لەمەوبەر کچێك لە ناو کەپرێکی سادەو دوور لە شار لە ناو خانەوادەیەکی هەژاردا، لە دایکبوو، بەڵام ئەو کچە بەر لە کاتی خۆی هاتەدنیاوە، کۆرپەیەکی پێنەگەیشتوو لاوازو ناسك بوو، هەمووان گومانیان لە زیندومانی بوو، کاتێك تەمەنی بوو بە چوار ساڵ، نەخۆشی ڕیخۆڵەو زەردویی پێکەوە گرت، تێکەڵەیەکی مەترسیدار کە قاچی چەپی لە کارخستو شەلی کرد. بەڵام ئەو بەختی باش بوو، چونکە دایکێکی هەبوو کە هانی دەدا ئومێدی بە ژیان هەبێتو هیچ کات نائومێد نەبێت، ئەمەش مایەی دڵخۆشی ئەوبوو، هەموو جارێك دایکی پێی دەگوت: وێڕای ئەو کێشەیەی کە لە قاچتا هەیە، دەتوانیت هەر کارێکت پێخۆشبێت لە ژیانتدا ئەنجامی بدەیت، هەر ئاواتێکت هەبێت پێی بگەیت، بەڵام تەنها شتێك کە پێویستە، باوەڕ بەخۆبوونو ئارامگرتنە لە بەرامبەر ئەو کۆسپانەی کە لە ژیانتدا دێتە ڕێگەت.

بەردەوامی لە کارو بوێری، ڕۆحێکی خۆڕاگرییە. ئەم کچە لە تەمەنی نۆ ساڵیدا بە هۆی ئارامگرتنەوە قاڵبە ئاسنینەکانی دەرهێنا، بە پێچەوانەی ئەوپزیشکانەوە کە دەیانگوت: هەرگیز ناتوانێت بە شێوەیەکی سروشتی بەڕێگەدا بڕوات، بەڵام کچەکە بە ئومێدو خۆڕاگرییەوە بەردەوام بوو لە مەشقکردنو خۆڕاهێنان لەسەر ڕۆیشتن، تا سەرەنجام توانی هەنگاوی ڕێكو بڵند بنێتو بە ڕێکی بە ڕێگەدا بڕوات، ئەمەش چوار ساڵی خایاند، ئەمە موعجیزەیەك بوو. ئەو ئارەزوویەکی هەبوو کە شایەنی باوەڕکردن نەبوو، ئەو ئومێدەوار بوو ببێت بە گەورەترین ڕاکەری ژنی جیهان، بەڵام بەو قاچانەیەوە واتای ئەو ئارەزووەچی بوو؟

لە (١٣) ساڵیدا بەشداری لە پێشبڕکێیەکی ڕاکردندا کرد، بوو بە دواهەمین کەس، هەموو هاوڕێو دۆستانی بەردەوام ئامۆژگارییان دەکرد کە واز لەم کارە بهێنێت، چونکە ئەو بەو حاڵەوە ناتوانێت سەرکەوتن بە دەست بهێنێت، بەڵام ئەم قسانە چۆکی پێ دانەداو بەردەوام بوو لەسەر ئارەزووەکەیو بە هۆی بڕوا بە خۆبوونو ئارامگرتنەوە، ڕۆژێك داهات بوو بە پاڵەوانی پێشبڕکێ!

لەمە بەدواوە (ویلیما) لە هەر پێشبڕکێیەکدا بە شداری کردبێت بردویەتییەوە، لە ساڵی ١٩٦٠ چووە یارییەکی ئۆلۆمپی، لەوێ کەوتە بەرامبەر یەکەم یاریزانی ڕاکردنی ژن، بەڵام ئەو ورەی خۆی نەڕووخاند، نەیگوت: من ناتوانم سەربکەوم، بەڵکو دەیگوت دەتوانم سەرکەوتن بە دەستبهێنم، ئەو کچە کە بەر (ویلیما) کەوتبوو، کچێکی ئەڵمانی بوو، تا ئەو کاتە کەس نەیتوانی بوو شکستی پێبهێنێت، بەڵام (ویلیما) بە هۆی بڕوابەخۆبوونەوە توانی سەرکەوتن بەدەست بهێنێتو پێشبڕکێکە بباتەوە، لە ڕاکردنی١٠٠مەترو ٢٠٠مەتر،٣ مەدالیای ئۆلۆمپی وەرگرت، ئەو لەو ڕۆژەدا یەکەم ژن بوو، کە توانی لە خولێکی ئۆلۆمپیدا (٣) مەدالیایی زێڕ بەدەست بهێنێت، لە کاتێکدا پزیشکەکان پێیان وتبوو کە هەرگیز ناتوانێت دووبارە بە ڕێگەدا بڕوات. (ویلیما) لە ژیاندا هەرگیز وشەی مەحاڵی بەکارنەهێناوە، چونکە لە فەرهەنگی ژیانیدا سڕیبوویەوە، ئێمەش باوەکو (ویلیما) وشەی مەحاڵ لە فەرهەنگی ژیانماندا بسڕینەوە.

چونکە ئەگەر ئێمە لە یەکەم هەنگاودا بە سەرکەوتن بگەیشتینایە، هەوڵ و تەقەلالاو ماندووبوونو تێکۆشان، ئیدی واتایەکی نەدەبوو!

گوڵان حەمە ئەمین

# با لە کاتی نیگەرانییەکاندا، بەها باڵاکان لە دەست نەدەین



مرۆڤ لە کایە جۆربەجۆرەکانی ژیاندا رێـی لـە زۆر هـەورازو نشـێوی سـەخت دەکەوێـت، هەندێجار لـە بەرزییەکا خۆی دەبینێتەوە کە پێی وایە هەرگیز رەشـەبای بێهیوایـی ناتوانێت چرای ئومێدی خامۆش بکاتو دەستەوسـانی کات لە ئاست ئامانجو خولیاکانیـدا، بەڵام هەندێجاریش شـەپۆلە سـەختەکانی ژیان بەرەو نزمییەکی دەبەن کـە هیچ رووناکیو ئومێدێك بە دی ناکاتو وا دەزانێـت چیـدی ئومێدێـك بـۆ ژیانی نەماوە، ناتوانێت دڵی بە ژیانی خۆشبکات!

ئەمە هەمووی راسـتەو رۆژانە ژیانمان بەمجـۆرە دەگوزەرێت، ئـەوەی کە گرنگەو مەبەسـتی سـەرەکی بابەتەکـەی ئێمەیە، ئەوەنییە کە بۆ دەبێت ژیان هەورازو نشێوی سـەختی تێدابێت، بەڵکو ئەوە یاسای ژیانی دونیایەو بۆ هەمووان هەر بەو شـێوەیەیە، هیچکات ژیان بـێ زبریو نیگەرانی نەبووە بـۆ هیچ کەس، بـەڵام ئەوەی ئێمە باسـی دەکەین ئەوەیە کە مرۆڤی ژیرو سەرکەوتوو هەڵوێسـتی چۆن دە بێت لە کاتی تەنگانەو نیگەرانییەکانـدا، ئازیـزان هەنـدێ کەس لـە کاتی رووبەڕووبوونـەوەی رۆژە دژوارو هەنگاوە سـەختەکانی ژیانـدا، چی بە های رەوشتیو مرۆڤ دۆستییە لە دەستی دەدەن، بەمـەش رابـردووی خۆیـان دەخەنە ژێر پرسیارو گومانەوە لای دۆستانو هاوەڵانیان، نزیکەکانیـان بێهیوا دەکەن لە داهاتوویان!! بە جۆرێك سنورەکان دەشکێنن وەك ئەوەی مرۆڤێـك بـن ژیرییـان لـە دەسـتدابێت، ئەمـەش ئەو جۆرە مرۆڤانـەن کە ناتوانن هیـچ سـەروەرییەك بـۆ خۆیـان تۆمـار بکەن لە سـەر شـانۆی ژیان، مرۆڤێکی بێ ئەزموون دەبنو هیچ کات نابنە پێشـەنگو نموونـەی جـوان، نابنـە سەرمەشـقی مەردایەتـی، راسـتییەکان دەشـێوێننو بە شـکاندنی کەسـانی دی نزمییەکانی خۆیان دەشـارنەوە، بە تاڵە مـووی باریکی درۆوە گوریسی سـەختی ژیان گرێدەدەن، بەمەش ژیانێکی پڕ لە ناسۆر بەسەر دەبەن، چونکە نایانەوێـت رۆژەسـەختەکان بکەنە پەیژەو پێیدا سەرکەون بەرەو رۆژە ئاسودەییەکانو دونیایەك لە رێزو بەرزیو متمانە بە دەست بهێنن لـە دەوروبەریانەوە، خۆشەویسـتان زۆر گرنگە کە بزانین ژیانی دونیا کۆمەڵێك تایبەتمەندی هەیە:

١- ژیـان بـێ کێشـە نەبـووەو نابێت: کەواتـە کاتێـك کێشـەیەك رووبەڕوومان دەبێتەوە، پێویستە ئارام بگرین.

٢- مـرۆڤ بـە نارەحەتـیو نیگەرانی پێـدەگاتو ئەزموون وەردەگرێـت: کەواتە بـا کاتێك دووچـاری نیگەرانییـەك دەبین وابزانیـن لە خولێکـی راهێناندا بووین، بۆ گەشەی ناخو بەهێزکردنی کەسایەتیمان.

٣- کێشەکان تاسـەرنابن: کەواتە با لە کاتی بوونی کێشـەکاندا ئـەوەی هەمانە لە دەستی نەدەین.

٤- بزانە هیچ شتێك لە خۆوە روونادات، بەڵکو بەڕێوەبەرێکی زۆر ورد بینو کارسازو دانا، هەموو رووداوەکان پێش دەهێنێت.

کەواتـە خـۆی دەزانێت کـەی وەختی نیگەرانییەو کەی وەختی شادمانییە، هەمووی بە ویسـتی ئەوەو پڕیەتی لە داناییەکی بێ وێنـە، گەر هـەر کام لە ئێمـە بزانین ئەو نیگەرانییە چەند سودو دانایی تێدایە ئەوا خۆمان داوای هاتنی ئەو نیگەرانییە دەکەین، وتراوە بۆئەوەی ئاڵتوونێکی پاڵفتەو ساغت دەسـتبکەوێت، دەبێـت بیدەی لـە ئاگر تا رووە راسـتەقینەکەی بمێنێتەوە، بە راستی ئێمـەش بـە نارەحەتـیو تاقیکردنەوەکان ژەنگو چڵکی خراپەکانمان لێدەبێتەوە.

گەر کەسـێکی خۆگـرو ئـارام گربین، دەتوانیـن ئەزموون وەرگریـنو لە هەموو نیگەرانییەکـدا حیکمەتێـك بدۆزینەوە، چ دایكو باوکێك لـە کاتێکدا لە منداڵەکانیان دەدەن رقیان لە منداڵەکانیانە؟! بەراسـتی ئـەوە لەوپـەڕی خۆشەویسـتییانە بۆیان، بۆئـەوەی باشـترین کەسـبێتو دوور لـە هەڵە بێـت، خوای گـەورەش کاتێك زللەی میهرەبانیمـان لێـدەدات ئـەوە لەوپـەڕی میهـرو سـۆزییەوەیەتی بۆمـان تاقیرمان بـکات، زۆر بە دونیای نزمەوە نەنیشـینو ژینو ئومێـد گەلێکی پێوەگرێ نەدەین، بە هەمـوو هەڵپەیـەك بمانەوێت بـە تەواوی خۆشـییەکان بگەیـن، بەڵکو هەمیشـە لە خۆشییەکانماندا بەشـێك تاڵیو نەهامەتی وای تێـدەکات تابزانین ئەمـە دونیایەو لە دونیاشـدا دەبێـت وەك رێبوارێـك لە ژێر سـایەو سـێبەری دارێکدا وچانێك دەدەینو پاشـان دەڕۆین، گـەر ئاوابڕوانینـە ژیان، هەرگیز بە لە دەستدانی شتانێك بەهاباڵاکان لە دەسـت نادەینو ئارامگرانە وەك کێوێك رووبـەڕووی نیگەرانـیو تەنانـەت زوڵمو سـتەمەکانیش دەبینـەوە، وەك چیایەکـی سـەرکەش بێئـەوەی رووداوەکان بمانخەن، ژیانمان بە رێدەکەین.

شیرین نەجمەدی

# چەند خولەکێك لە کاتی تۆ، هەموو ژیانی منی ڕزگار کرد!



ژیانــم زۆر ئاڵۆز بوو، ئاخر چی بکەم منیــش گەنجێــك بــووم ئاواتەخوازبووم وەك هەموو گەنجەکانی دونیا، گرفتەکانم بەرمەوە بۆ لای دایکو باوکم، یان خوشكو براکانــم، بەڵام قــەدەری خودا وابوو هیچ یەکێك لەمانەم نەبــوو. من قوتابی پۆلی ســێیەمی ناوەندی بووم، ڕۆژانە کۆمەڵێك پێداویســتیم هەبــوو، وەك بڕێك پارە لە باخەڵمــدا هەبێت، پێداویســتی وەرزشــی وەك کالــەو جلــی یاری، بۆئــەوەی حەزە وەرزشــییەکانم بێنمــە دی، بەڵام کێ بۆم بکڕێت، دەڕۆمەماڵەوە تەنها نەنکێکی پیر نەبێت کــەس چاوەڕێم ناکات، نەنکیشــم هیچ کات لە من تێنەدەگەیشــت، هەر کات پێم دەگوت: ئەو شتانەم بۆ بکڕە بە توندی بەرپەرچی دەدامــەوەو دەیگوت: ئاخر تۆ ئەمانــەت بۆچییە، چییان لــێ دەکەیت؟ ســەرەنجامی هەمــوو داواکارییەکانــم بە شەڕو دەمەقاڵێ کۆتایی دەهات، ئەم شەڕوو پێکدادانە کاری ڕۆژانەمان بوو. ڕۆژانە من لەم بێکەســییەدا دەتلامەوە، هەر بەم دڵە شــکاوییەو دەروونە ئاڵۆزەوە دەڕۆیشــتمە قوتابخانــە، لەوێــش نــە هاوڕێکانــم نە مامۆســتاکانم بــە حاڵی شــپرزی منییان نەدەزانــی، هەمــوو ڕۆژێك هــەر ئەرکی قوتابخانــە، لێپرســینەوە، بــۆ ســەعیت نەکردووە بۆ، بۆ، بۆچی؟؟.. هتد.

ســەرەنجام ئــەم هەموو کارەســاتانە کــە نەمدەزانــی چارەســەرییان لە کوێیە منییان بــە ئاڕاســتەیەکی خراپدا گۆڕی، ئیتــر گوێم لە هیچ شــتێك نەمــا، ژیان لای مــن هەمــووی بێ بەها بــوو، هەموو ئــەم خۆخواردنەوانەم بــە جۆری جیاواز بە ڕووی چواردەورەکانمــدا دەتەقاندەوە، بە مامۆســتاکانم دەگــوت: ئیتر من هیچ ئەرکو پرســیارێکی ئێوە وەڵام نادەمەوە، بــە نەنکیشــم دەگــوت: ئیتــر من جگە لە نەوەیەکی لاســارو خراپ هیچ شــتێکی تــر نیم بۆ تۆ، بە هاوڕێکانیشــم دەگوت: بە مشــاغەبەو هارییەکانم پۆلەکەتان بۆ تێکدەدەم، نایەڵم هیچ ســودێك لەو وانانە وەرگرن. بەڵام لە ناخیشمدا دەمگوت ئاخ بۆ کەسێك لە نیگاکانی چاوم دەگەیشت، دەدا لــە دەرگای دڵمو بۆ چەنــد خولەکێکیش بووایــە ڕازەکانی دڵی منــی لەگەڵ خۆی دەکردە میوان. تۆ بڵێی لەم دونیایەدا وەها کەسێك نەبێت؟

ئاخر دەکرێت مامۆستاکانیشــم هێندە دڵــڕەق بــن، خــۆ مامۆســتا وەك دایكو بــاوك وایە بــۆ قوتابییەکانی، ئەی بۆچی دەنگی میهرەبانی ئــەوان ناگاتە من؟ خۆ من هێندە تاوانبارنیــم هەموو ڕۆژێك لە ژووری بەڕێوەبــەر لێپچینــەوەم لەگەڵدا دەکرێــت، باشــە دەکرێــت ئــەو هەموو پرسیارانە وەڵامیان نەبێت؟!!

بەڵام خۆشــبەختانە هەلی ڕزگاربوون لــە مەینتییــەکان هــەردەم والآیــە، گەر کەســێك بیەوێــت، دوای چاوەڕوانییەکی زۆر ســەرەنجام ئــەو دەســتە میهرەبانە پێمگەیشــت، مامۆســتایەك هەســتی بەم هاوارانەی ناخی من کرد، ئەو مامۆســتایە نــاوی م. فێنك بــوو، چاوەکانی لە وێنەی خۆشەویســتی خوشــکێك دەچوو، کاتێك دەســتەکانی هێنــا بە ســەر ئــەم هەموو برینەمدا، فێنکایی ســەرتاپای جەســتەی تەنیمەوە. بۆ یەکەمجار پێی وتم: محەممەد بۆچی بــەم شــێوە خراپە هەڵســوکەوت دەکەیت؟ سەرنجی دەوروبەر بۆ لای خۆت ڕادەکێشــیت؟ من خوشکی تۆم، تۆش وەکو

برا بچکۆلانەکەم، چ کێشەیەکت هەیە من دەتوانم یارمەتیت بدەم؟

ئای مامۆستا گیان، ئەو وشانەت چەندە جوانن، بۆنی میهرەبانی لێ دێت، من ئەوەندەش خراپ نیم، بەڵام کەسم نییە، جگە لە نەنکێکی پیر، ئەویش هیچ لە من تێناگات، داوای هەرچییەکی لێ دەکەم بە توڕەییو شەڕەوە وەڵامم دەداتەوە، نازانم داوای پێداویستییەکانم لە کێ بکەم؟

- محەممەد ئەوە نەنکی تۆیە، تۆ دەبێت ئێستا ئاگات لەو بێت، هەوڵ بدە بە زمانی خۆی داوکاریو کێشەکانتی تێبگەیەنیت، پاشان تاکە چارەسەر بۆ ڕزگاربوونت لەو کێشانە، ئەوەیە تۆ گرنگی بە خوێندن بدەیتو بتوانیت سەرکەوتووانە خوێندنەکەت تەواو بکەیت، دوارۆژێك بۆ خوت دیاری بکەیت، من بەڵێنت پێدەدەم، گەر تۆ بەرەو باشی بڕۆیت، بە هەموو مامۆستاکان دەڵێم: کە بە باشی مامەڵەت لە گەڵدا بکەن، هەر پێوستییەکیشت هەبوو، لەمەودوا وەرە بۆ لای منو بە خوشکی خۆتی بڵێ!

ئەم وشانە بۆ مامۆستا چەند خولەکێکی پێچوو، بەڵام بۆ من تەواوی گۆڕانکاری بوو لە ژیانمدا، چونکە لەو ڕۆژە بە دواوە وازم لە دەمەقاڵێ لەگەڵ نەنکمدا هێنا، بڕیاری ئەوەم دا، ڕەوتی خۆم لە خوێندنگا بگۆڕم، هەر ئەو ساڵە پۆلی (٣) ناوەندیم تەواوکرد، لە ئامادەیی پیشەسازی وەرگیرام، ئەویشم بە سەرکەوتوویی تەواو کرد، بە هۆی بڕوانامەکەمەوە کارێکی باشم دەستکەوت.

ڕۆژێك جانتایەکم پێبوو، لە کار دەگەڕامەوە، لە ڕێگادا مامۆستا فێنکم بینی، حەزم دەکرد پڕ بە دەنگ هاوار بکەم، بڵێم مامۆستاگیان، هەموو ژیانم فیدات بێت، ویستم بەرەو ڕووی بڕۆمو دەستە فێنکەکانی ماچ بکەم، بەڵام ڕووم نەهات، هەربۆیە تەنها لە ناخەوە سوپاسم کردو ڕێزو پێزانینی خۆم بۆ هەموو ئەو ئامۆژگاریو دڵسۆزییەی دەربڕی کە بووە هۆی گۆڕانی سەرتاپا ژینی من.

لێرەوە دەڵێم: مامۆستایانی بەڕێز، ڕەنگە قوتابییە هاروهاجەکانی ناو پۆل، هۆکارێك هاندەر بێت بۆ ئەو کارانەیان، توخوا مامۆستایان لە دەرگای دڵیان بدەنو چەند خولەکێك لە کاتی خۆتانیان بە تەنها پێ بدەن، وتەکانی ئێوە بۆیان لە هی هیچ کەسێکی تر ناچێت، پێویستیان بەو میهرەبانییەی ئێوەیە، تکایە ڕزگاریان بکەن.

شاخەوان جبار

# زانستو مامەڵە ئەخلاقییەکان



هەر لە هاتنەبوونی مرۆڤ، تا ئێستاش زانست سەرمەشقی مرۆڤەکان بووە لە داهێناندا، ئەزمونیش زۆرجار بنەمایەکی گرنگی داهێنان بووە، هەر زانستیشە ڕۆح بەبەر داهێناندا دەکات. داهێنانیش بە ڕەخنەوە کامڵتر دەبێت.

بەڵام ئەوەی گرنگە، ئەوەیە ئایا زانست بۆ مرۆڤو ژیانی، تاکە بنەمایە لە کەسێتیدا، یان لەگەڵ ئەم بنەمایەدا ئاڕاستەی تر بوونی هەیە؟

نا مامەڵە ئەخلاقییەکان بنەمایەکی تری کەسێتیو ژیانی مرۆڤە، لەو بڕوایەدام زانست بەبێ مامەڵە ئەخلاقییەکان زۆرجار مانای خۆی لە دەست دەدات، هەندێجار نەك هەرخزمەت نەکردن، بەڵکو گەندەڵی بە هەموو جۆرەکانییەوە دێنێتەبوون! هەر بۆیە گرنگیدان بە یەکێکیانو وازهێنان لەوی تریان کارێکی زۆر هەڵەیە.

بەڵکو ڕاستروایە ڕیزبەندی ((یوسف پەیامبەر) سەلامی خوای لێبێت) ئاسا بکەینە پێوەر لە گرنگیدان بەم دووانە، کاتێك دەیەوێت ببێتە دەسەڵاتداری میسر، لە بەرامبەر بەرپرسەکانی ئەو سەردەمەدا دەفەرموێت: (انی حفیظ علیم)، واتە من پارێزگارو دانام، سەرنج بدە ئەگەرچی (یوسف) پەیامبەرەو لە گشت مرۆڤەکان زاناترو داناتر بووە، بەڵام یەکێك لە مامەڵە ئەخلاقییەکان کە پارێزگاری کردنەو بە بەهاترو لە پێشتر دەزانێت لە بەجێهێنانی پیشەکاندا، هەربۆیەش ئەگەر لەو سۆنگەیەوە لە پیشەکانی هەر مرۆڤێکمان ڕووانی کە بە کردەیی کردنی فیکرو وتە زارەکییەکانێتی، ئەوا کتومت گرنگی ئەم ڕیز بەندییە بە دی دەکەین، هەر لە ڕامانی پیشەیەکی وەك پزیشکی دەبینین، ئەگەرچی بوونی بڕوانامەی پزیشکەکە پێویستە، بەڵام ئەگەر لە کەسێتیدا مامەڵە ئەخلاقییەکان بوونی نەبێت، هەندێجار ئەوە هەر لە ڕێوە پیشەکەی وەك هەلێکی بازرگانی بەکار دێنێت، با چارەسەری نەخۆشییەکەشی ئاسان بێتو لە نەخۆشخانەکەی چارەسەر بکرێت، ئەوە ڕەوانەی نۆرینگەی تایبەتی خۆی دەکات، یان ئاشکراکردنی نهێنییەکانی نەخۆشو ...هتد. یان پیشەیەکی وەك ئەندازیاری بە هەمان شێوە ئەگەر مامەڵە ئەخلاقییەکانی لە بونیاتنانی کەسێتیدا بوونی نەبێت ئەوە لە پڕۆژەکەی دزیو غەش دەکاو لە دروستکردنی باڵەخانەو ڕێگاو بانەکانی کەمترین کەرەستەی پێویست بەکاردێنێت، هەربۆیەش سەرەنجام هەرەسهێنانو دارمانو هەڵوەشاندنەوە بەرهەمێتی.

بۆیە لە نەبوونی مامەڵەئەخلاقییەکاندا ئەو کەسە چەندە شارەزاو زیرەکترو بە تواناتر بێت، ئەوە گەندەڵترە! جا بە تێڕوانینەکانی د.عەلی شەریعەتی ئەوە ڕۆشنبیرێکی گەندەڵە! بەڵام ئالێرەدا پرسیارێکی گرنگ دێتە ئاراوەو بوونی خۆی فەرز دەکات، دەپرسێت ئاخۆ سەرچاوەی مامەڵە ئەخلاقییەکان چییە؟

لە وەڵامی ئەم پرسیارەدا پەنا بۆ نووسینەکانی د.علی عیزەت بیگۆڤیچ دەبەین کە لە باسی ئەخلاقدا دەڵێت: (دەکرێت کەسانێکی بێباوەڕ هەبن لە هەڵسوکەوتو مامەڵەی کۆمەڵایەتییاندا، (ئەخلاقی کرداریان)هەبێت، واتە: وەکو بوونەوەرێکی کۆمەڵایەتی ئەخلاقدار بن، بەڵام هیچ سیستمێکی ئیلحادی نییە بتوانێت لە بنچینەدا پارێزگاری لە بنەما ئەسڵیو جەوهەرییەکەی ئەخلاق بکات)!

بۆیە ئەگەر بەم پێوەرە لە کەسێتی مرۆڤەکان بڕوانین، ئەوا لەو ساتانەشدا ناکەوینە هەڵەوە کە کەسانێك هەبن لەبەرئەوەی سیمای ئاینییان نییە، ئیدی لە ڕیزی ئەخلاق کرداریدا ڕیزبەندیان نەکەینو لەم بنەمایەی کەسێتیاندا بێبەشیان کەین، ئەمە لە کاتێکدا کە ئەو کەسانە خاوەنی مامەڵەی ئەخلاقی بن.



و: لە ئینگلیزییەوە: دانەر عبدالرحمان

# دوێنێ لە بیربکەو دەست بە ڕۆژێکی نوێ بکە

ئێمە هەندێجار چاو لە ڕۆژێکی نوێدا دەکەینەوە، بەڵام بە ئەقڵی دوێنێ مامەڵە دەکەین، بیر لەو هەڵانە دەکەینەوە کە لە ڕۆژی پێشوودا ئەنجاممانداوە، لەوانەیە بە خۆمان بڵێین: چۆن ئەو کارەم کرد؟ چۆن ئەو شـتە ڕوویدا؟ هەستمان چەند خراپ بـوو لە بارەیانەوە؟ شـتێکی سـەیر نییە ئەگەر ئەمجـۆرە بیرکردنەوانـە ببن بە بەربەستێك بۆ ڤاڵبوونەوە لە ڕۆژی نوێدا، هەربۆیە ناتوانین بە تەواوی ڤاڵ ببینەوە لـە ڕۆژی نوێمانو ئـەركو كردارەكانمان ئیفلیج دەكەیـنو جارێكی تر وەك ڕۆژی پێشوو هەمان هەڵە دووبارە دەكەینەوە.

ئەم شـێوازەش دەكرێت دووبارەو سێ بارە ببێتـەوە، لە كاتێكـدا هەرچی باری ڕۆژی ڕابـردوو هەیـە بیهێنینو بیخەینە سەرشـانی ئەمڕۆمـانو بارگرانی بكەین، پاشـانیش دیسانەوە ببێتەوە بە بارێك بۆ ڕۆژی دواترمان. ئەوا ئەم زنجیرەیە هەروا بـەردەوام دەبێت، لەوانەیـە ببێتە ڕێگر لە بەردەم سـەركەوتنی ئـەركو كرداری ڕۆژانەمانو تێكدانـی باری دەروونیمانو هەبوونـی مێشـكێكی ئـارام، مەگـەر بە هـەوڵو كۆششـێكی زۆر نەبێـت بتوانین بیپچڕێنین.

لەبەرئـەوە زۆر گرنگە دوێنێ لەدوای خۆمـان بەجێبهێڵینو ماڵاوایی لێ بكەین، هەمیشە لەگەڵ هاتنی ڕۆژی نوێدا، دەست بـە ڕۆژێكـی نـوێ بكەین، بـە بێئەوەی بیر لـە دوێنێ بكەینەوە. ئەم شـێوازەش یارمەتیدەرمان دەبێت بۆئەوەی بە تەواوی توانای ڤاڵبوونەوەو چاككردنو ئەنجامدانی باشترین كاروكردارمان هەبێت.

ئەمانـەش چەند هەنگاوێكن بۆئەوەی دەروونێكی پاكت هەبێتو بتوانیت لەگەڵ هەڵهاتنی ڕۆژی نوێدا كاری نوێ بە ئەنجام بگەیەنیت:

**یەكەم: ڕۆژەكەت هەڵسەنگێنە:**

لـە كۆتایی ڕۆژەكەتـدا هەندێك كات تەرخـان بكە، بۆ بیركردنـەوە دەربارەی ئـەو كردارانـەی ئەنجامتـداون، ئەمەش دەبێت لە هەمان ڕۆژدا بكرێتو نەخرێتە ڕۆژی دواتر، چونكە دەبێت مامەڵە لەگەڵ ئەمڕۆت تەواو بكەیـت پێش ئەوەی چاو بە ڕۆژێكی تر هەڵبهێنیت.

مەبەسـت لەم كاتـە تەرخانكراوە بۆ ئەوە نییە پەشـیمان ببیتـەوە لە خراپی ڕۆژەكـەت، لـە هەڵەكانت كـە ئەنجامت داون، یاخود لەوەی كە خەڵكی چۆن خراپ مامەڵەی لەگەڵدا كردوویت، چونكە ئەمە یارمەتیت نادات ژیانی خۆت بەرەو پێشەوە ببەیت، بەڵكو مەبەسـت ئەوەیە بتوانیت چەنـد وانەو پەندێـك لـە دەرئەنجامی كردارەكانتـدا دەربهێنیـتو لەگەڵ خۆتدا بیبەیت بۆ ڕۆژی دواتر.

**دووەم: بۆ وەرگرتنی پەندو ئامۆژگاری، پرسیاری دروست لە خۆت بكە:**

بـۆ ئـەوەی ئـەو هەڵانـەی ئەمـڕۆ ئەنجامت داوە، ببن بە پەند بۆ سـبەینێ، پێویستە دوو پرسیاری ڕاستو دروست لە خۆت بكەیت:

- ئەمـڕۆ چ شـتێكم بـە باشـی ئەنجامداوە؟

ئەگـەر ئەمڕۆ چەند شـتێكی باشـت كردبێت، ئەوانە چینو چۆن ئەنجامتداون؟ دەتوانیت چی بكەیت بۆئەوەی دڵنیا بیت كە دەتوانیت دووبارە بەردەوام بیت لەسەر بە ئەنجامگەیاندنیان بە باشـیو تەنانەت باشتر.

- ئەمـڕۆ چ شـتێكم بـە هەڵـە ئەنجامداوە؟

هەروەهـا وەكـو هەمیشـە ڕۆژانـە مرۆڤەكان هەڵە دەكەنو چەند كردارێك لە كاتی ئەنجامدانیدا بەو شێوەیە دەرناچێت كە چاوەڕوانت دەكرد، ئەوانە چینو چۆن ڕوویانـدا؟ دەتوانیت چی بكەیت بۆئەوەی خـۆت چاك بكەیتـەوەو خۆت بـە دوور بگریت لە دووبـارە ڕوودانی هەمان هەڵە لە داهاتوودا.

**سـێیەم: پابەندبـە بـە ئەنجامدانی پەندو وانەكان:**

لە پاش ئەوەی زانیت هەڵەکان چینو کردت بە وانەیەك بۆ خۆت، ئێستا کاتی ئەوە هاتووە پابەندبیت بە ئەنجامدانیان. بۆئەوەی بتوانیت ئەم هەنگاوە جێبەجێ بکەیتو پشتگوێیان نەخەیت، لەسەر زەنگی مۆبایلەکەت، یاخود لە ناو دەفتەرێکدا هەڵەکان دیاری بکەو وانەکان بنووسەوە، بۆئەوەی بە بیری خۆتدا بیهێنیتەوە بۆ ئەنجامدانیان.

**چوارەم: ڕۆژەکەت دابخە:**

دوای بە سەربردنی ئەو کاتەی کە داتنابوو بۆ بیرکردنەوە لە بارەی ڕۆژەکەتو دەرهێنانی پەندو وانەکان، بڕیاربدە دەرگا لە ڕۆژەکەت دابخەو بڵێ من تەواو کاری خۆمم کرد لەگەڵ ئەم ڕۆژەداو ئیتر بیری لێ ناکەمەوە، چونکە تاوەکو دەرگا لەسەر ڕۆژی ڕابردوو دانەخەیت، ناتوانیت بە شێوەیەکی گونجاو دەست بە ڕۆژێکی نوێ بکەیت.

بۆئەوەی بتوانیت ڕۆژەکەت بە ئاسانی دابخەیت، بیرێك لەم ئامۆژگارییانە بکەرەوە.

- ڕۆژەکەت تێپەڕیو تازە ناتوانیت هیچ شتێك بکەیت. هەرگیز ناتوانیت ڕابردوو بگۆڕیت، ئیتر گرنگ نییە چەندە بەبێ ماندووبوون کاری بۆ بکەیت.

- لە جیاتی ئەوەی بیر لە شتێك بکەیتەوە کە ناتوانیت بیگۆڕیت، بیر لە شتێك بکەرەوە کە دەتوانیت بیگۆڕیت، ئەوەش بریتییە لە هەنووکە، چونکە قاڵبوونەوە لە هەنووکەو گۆڕینی شتەکان، یارمەتیت دەدات بە ئاسانی ڕۆژەکەت دابخەیتو لە دوای خۆت بەجێی بهێڵیت.

**پێنجەم: جگە لە وانەکان هیچ شتێکی تر لەگەڵ خۆت مەهێنە بۆ ناو ڕۆژی نوێ:**

پاش ئەوەی بڕیارت دا، ڕۆژەکەت دابخەیت، پێویستە هیچ لەگەڵ خۆت هەڵنەگری بۆ ڕۆژی دواتر، جگە لە ئەو وانانەی لێوەی فێربوویت، چونکە وانەکان مامەڵە لەگەڵ شتی نوێدا دەکەنو دەتوانیت خۆت پێش بخەیت لە کارو کردەوەتدا. ئەو وانانە مامەڵە لەگەڵ هەنووکەدا دەکەن نەوەك ڕابردوو، بۆیە لە جیاتی ئەوەی بیر لە ڕابردوو بکەیتەوە، بیر لە پابەندبوونت بەو وانانە بکەرەوەو لە هەنووکەدا جێبەجێیان بکە. بەم شێوەیە دەتوانیت دەست بە ڕۆژێکی نوێ بکەیت، بەبێ هەڵگرتنی باری دوێنێ.

سەرچاوە: lifehack



# هەستێك بۆ ئێوە

پەیام عوسمان

چەند جوانە مرۆڤ لە ناو ئەو هەموو جەنجاڵیو ناڕەحەتیو ئازارەی ژیاندا لێو بە خەندە بێت، تەنها بۆ ڕازیکردنی ئەو پارچە گۆشتە بچکۆلانەی مرۆڤ کە تەنها بە وەستانی ترپەکانی، ژیانی کۆتایی دێت، ئەویش ئەو شوێنەیە کە مەڵبەندی خۆشەویستییە.. (دڵی بەرامبەر).

کاتێك ناڕەحەتم مەڵێن خەمبارە، چونکە ئا لەم ساتە وەختەدا بیر لە خەمەکانی ئێوە دەکەمەوە، بیر لە کۆسپەکانی بەردەمتان دەکەمەوە، کە ڕێگرن بۆ سەرکەوتنتان لە کاروانی ژیان، بیر لە گرفتەکانی ناو خێزانەکانتانو ماڵو منداڵتان دەکەمەوە، ئەو کاتانەی لەوپەڕی بێ ئومێدیدان، بەڵام خوای گەورە بە تەنها چرپەیەك ڕۆحتان ئارام دەکاتەوە، هێمنی دەکاتە میوانتان، دەزانن چۆن؟؟ کاتێك ڕوو دەکەنە مەنزڵی پەروەردگارو بەوپەڕی تواناتان لێی دەپاڕێنەوە، تا کارەکانتان بۆ ئاسان بکات، خەمو پەژارەکانتان لەسەر لابەرێت، ژیانێکی بەختەوەرتان پێببەخشێت، بیر لەو کەسانە دەکەمەوە کە چەندان شەوە بێ شێو سەر دەنێنەوە، تەنها پارچەیەك نانیش شك نابەن تا سوکنایی بە گەرووی برسییان بدات، دەبێت ئێمە چۆن مرۆڤێك بین خۆمان تێرو کەسانی تر برسی؟

کاتێك لەوپەڕی خۆشحاڵیدام مەڵێن دڵخۆشە، چونکە بە خۆشیو کامەرانییەکانی ئێوە منیش شادو خۆشحاڵم، بە هەنگاوە نوێو پێشکەوتنەکانتان بەرەو ئایندەیەکی ڕوون، بەو ئامانجو هیواو ئارەزووانەی کە لە ناختاندا حەشاردراوە تەنها بە دەستپێکردن سەرەتای قۆناغێکی نوێی تەمەنتان دەبێت، هەوڵی ئێوە بۆ بە دەستهێنانیان، من لەوپەڕی بەختەوەریدا دەبم!

چەند جوانە مرۆڤ بتوانێت بەرامبەر کەسەکان هەستەکانی ناخی دەربڕێت، بەرامبەر چاکە، پێزانینی هەبێت.. بەرامبەر هەڵەکانیان لێبوردنی هەبێت، نەك تەنها لە خۆیان، بەڵکو لە خودی هەڵەکەشیان خۆشبن، دڵنەواییان بەرامبەر ئەو کەسانە هەبێت کە دۆستو ئازیزانیان لەدەست داوە، بەهەر هۆکارێك بێت، باوەشی میهر بۆ فرمێسکە بەخوڕەکانیان بکەنەوە، بەرامبەر هەر کێشەیەك ئەوان ئامۆژگاریکار بن، دڵسۆزی بۆ هەمووان جوانە، بەڵام ڕەنگدانەوەی لە کارو کردەوەی ئێمەدا جوانترە، با بەرامبەر مرۆڤەکان دڵسۆزبین، بە وەفاو بە ئەمەك بین..

ئەم هەستانە ڕەنگە کەمێك بن کە لە ناخماندا هەن، بەڵام تۆی ئازیزم هەستی جوانترو بەنرخترت لایە، تکات لێدەکەم بەرامبەر خۆشەویستانت دەریان ببڕە، ئەوە بزانە هۆکارێکە بۆ بەختەوەریت، چونکە مرۆڤ بە هەستەکانییەوە جوانە، هۆی دەربڕی دڵو ڕۆحی یەك بە یەکەی هەموومانە.

من هەستم بەرامبەرتان جوانترین هەستە، لە نزاکانم لە یادتان ناکەم، چونکە ئێوەن ڕێگەی ڕاستو بەرەو پێشچوونم پیشان دەدەن!

هەر ئێوەن دڕکەکانی سەر ئەم ڕێگایەم دەگۆڕن بە گوڵ، یارمەتیدەرن بۆ چارەسەری گشت کێشەکانم، منیش بەنرخترین دیاری خودای میهرەبانم بە ئێوە دەبەخشم، تکام لە دڵە بچکۆلانەکەتانە وەری بگرن. (خۆشەویستیم پێشکەشتان)!

زنجیرەی چوار
ئارام ستار بادلی

# چۆن تەرکیزت لە ناو پۆلو هۆڵەکان بەهێز دەکەیت؟



یەکێك لە باوترین کێشەکانی تاکەکان، نەبوونی تەرکیزە لە ناو پۆلو هۆڵەکانی خوێندنو دانیشتنو کۆبوونەوەو کۆنفراسەکان، زۆربەی کەسەکان لەگەڵ ئەوەی بە حەزێکی زۆرەوە ئامادەی دانیشتن، یان کۆبوونەوەکان دەبنو گوێ لە وتەکانی وتاربێژ، یان مامۆستا دەگرنو دوای چەند خولەکێك تەرکیزیان نامێنێتو کاتێك دێنە سەرخۆ ماوەیەك تێپەڕیووەو ئەوان لەو ماوەدا لە شوێنێکی تردا دەخولانەوە، ڕەنگە لە ماوەی ٢ کاتژمێر ئێوە تەنها بتوانن ٤٠ خولەك بە تەرکیزەوە گوێ بگرنو٨٠ خولەکەکەی تر بە شێوەیەکی بیربڵاوی لە ناو بیرۆکەکانی خۆتاندا قاڵ ببنەوە، ئەگەر ئێوە بتوانن لەو دانیشتنەدا زۆربەی بابەتەکە فێربن، دەبێتە هۆی ڕادەی کەمبوونەوەی چالاکی خوێندن لە ماڵەوە، بۆیە زۆربەی کات لەم حاڵەتانە بە خۆتانو دەوروبەرتان دەڵێن: چەند کاتژمێرێك لە ماڵەوە دەخوێنمو فلانەکەسیش کەمیش دەخوێنێت کەچی نمرەی لە من باشترە، بەڵام دەبێت ئاگاداربن ماوەی خوێندن گرنگ نییە، بەڵکو کاتی بەسوودو تەرکیز گرنگە، زۆربەی بەشی فێربوون لە ناو پۆلەکاندایەو دەبێت بۆتان تاقی بووبێتەوە کە فێربوونی ئەو وانەی کە ئامادەنەبوون چەندە سەختە، لێرەدا گرنگترین ئەو تاکتیکانە دەخەینەڕوو کە کاریگەریان هەیە لەسەر مانەوەی تەرکیز لە ناو هۆڵو پۆلەکاندا:

**١- هاوئاهەنگی لەگەڵ مامۆستاو وتاربێژ:** زۆر گرنگە بە خێرایی خۆتان لەگەڵ جۆرو چۆنییەتی وانەوتنەوەی مامۆستاو وتاربێژەکان ڕێکبخەنو لەگەڵیدا بچنە پێشەوە، چونکە نەبوونی هاوئاهەنگی لە خێراییو ڕەوشو چۆنییەتیو وانەوتنەوەی مامۆستا، ئێوە لە فێربوونی بابەتەکانی دواتر بێبەش دەکات، بۆیە زۆر پێویستە بە تەواوی هەرچی لە زاری مامۆستا بێتە دەرەوە گوێبیستی ببن، ئەگەر تێنەگەیشتن داوای لێبکەن بە دووبارەکردنەوەی بابەتەکەوخۆتان ڕابهێنن لەسەر شێوازی وانەوتنەوەو وتاردان.

**٢- گوێگرێکی چالاکو ئەکتیڤ بن:** باشترین ڕێگا بۆ ئەوەی گوێگرێکی باشبن یاداشت هەلگرتنە لەگەڵ مامۆستا، واتا تێبینییەکان بنوسرێن لە ڕێگای کاغەزوپێنووسو لەو وشانە سوود وەربگرن کە وەکو بڵێسەیەك هەموو بابەتەکان وەبیردەهێنێتەوە، بەشێوەیەکی کورت بێت، ئەم نووسینانە بە شێوەی خاڵ، یان پرسیارو دوای بیر لێکردنەوە لە بابەتە تێنەگەیشتراوەکانو سەرەنجام هانداںو بزواندن دروست دەبێت، بەمجۆرە نەکات بەفیـرۆدەڕواتو تێگەیشتنی بابەتەکانی دواتریشتان لە دەست دەچێت، مامۆستاکەش نارازی دەکەنو قورساییەکی گەورەش لە ناو مێشکتاندا کەمدەکەنەوەومێشکو هزر لە حاڵەتی بۆشایی دەهێڵنەوەو هەمیشە مێشکیش لە حاڵەتی ئامادەباشی دەبێت بۆ وەرگرتنو زۆر بە جوانی چاودێری خۆتان دەکەنو هیچ شتێکتان لە بیر ناچێتو تەرکیزیش بەهێزتر دەبێت، وەکو ڕۆژنامەنووسو پەیامنێرەکان کە هەرگیز تووشی بێ تەرکیزیو بێزاری نابن، یان زۆر بە کەمیو هەروەها هەر بە هۆی یاداشت هەلگرتن دووردەکەونەوە لە خەواڵوویيو باوێشکدانو بە تایبەتی کاتێك مامۆستاکە بەشێوەیەکی لەسەرخۆ بابەتەکە ڕوون دەکاتەوەو لە هەموو خاڵە گرنگەکان، پێویستە یاداشت هەڵبگرین، وانەکە هیچ جیاوازییەکی نییە لەگەڵ سەرەتاکەی لە ڕووی ماندوونەبوون.

**٣- دانیشتن لە ڕیزە یەکەمەکان:** چونکە ئەوانەی لە ڕیزەکانی یەکەم دادەنیشن، مامۆستاو پێداویستییەکانی تری شیکردنەوەی وانەکە دەبیننو کەمتر تووشی بیربڵاویو بێ تەرکیزی دەبن، بەڵام ئەوانی تر هەموو کەسەکانی پێش خۆیان دەبیننو سەرەنجام بە جوانی گوێبیستی شتەکان نابنو تەرکیزیشیان بە زەحمەت کۆدەبێتەوە.

**٤- ڕۆڵی فەرمانی زەینی:** واتا پێش چوونە ناوپۆلو کۆڕو کۆبوونەوەکان، بۆ خۆتان ئامانجێك دیاری بکەنو چەند پرسیارێك لە مێشکی خۆتاندا دروست بکەن، ئایا بۆ فێربوون دەچینە ناو پۆلو هۆڵ، یان بۆ پێکەنین، یان بۆ باوێشکدان؟ لەبەرئەوە زۆر پێویستە پێشوەخت فەرمان بە یادگاو مێشکی خۆتان بدەن، تاکو بیرتان پرشوبڵاو نەبێتو ڕزگارببن لە بێ تەرکیزی و وەڕەس بوون، بەڵکو فەرمان بە مێشکتان بکەنو بڵێن: ئەمڕۆ دەمەوێت ئەم بابەتە فێرببم، بەشێوەیەکی ئارەزوومەندانەو گەشبینانە، نەك بە خۆت بڵێیت هەرگیز فێرنابمو لە هیچ شتێك تێناگەم.



# زانیارییە هەڵەکانت ڕاست بکەرەوە

ئالانی

**١- ژەهری دووپشك كوشندەیە:** لە ڕووی زانستییەوە ئەم بۆچوونە دوورە لە ڕاستییەوە، زۆرێك لە ئێمە لەو باوەڕەدایە كە پێوەدانی دووپشك كوشندەیە، لە ڕاستیدا بەهێزترینو خراپترینی دووپشك، مرۆڤی ئاسایی ناكوژێت، بەڵام ڕەنگە ببێتە هۆی مردنی منداڵی شیرەخۆرە، یان كەسانی بەساڵاچوو، یاخود ئەو كەسانەی كە نەخۆشی دڵییان هەیە، ئەگەر چارەسەری پێویست وەرنەگرێت.

**٢- دوای ژەمە خۆراكێكی چەور، پێویستە بجوڵێیت بۆ هەرسكردنی خواردنەكە:** ئەمەش بۆچوونێكی هەڵەیە، چونكە جوڵان دەبێتە هۆی كەمكردنەوەی گەیشتنی خوێن بە كۆئەندامی هەرس، سەرەنجام كرداری هەرس هێواش دەكاتەوە.

بۆ نموونە شێر، دوای خواردنی ژەمەخۆراكێكی چەورو قورس، لە ژێر سێبەری درەختێكدا پشوو دەدات، ئەم هەڵسووكەوتەش بۆماوەییو سروشتییە، واتە ئەمە ڕاستە.

**٣- شێر لە دارستاندا دەژی:** بەداخەوە تەنانەت لە قوتابخانەكانیشدا ئەم قسەیە دووبارە دەكرێتەوە، لە ڕاستیدا شێر لە ناوچە گژوگیاویو دەشتەكاندا دەژی، هەرگیز لە دارستانە پانوبەرینەكاندا ناتوانێت نیشتەجێ بێت.

**٤- پشیلە حەز بە خواردنی مشك دەكات:** ئەم وتەیەش لە ڕاستییەوە دوورە، هەرگیز پشیلە مشك ناخوات، مەگەر زۆر ناچار بێت، بەڵام دوای دەكەوێت بە مەبەستی یاریكردنو بەسەربردنی كاتێكی خۆش لەگەڵیدا، واتە كاتی پێ بەسەر دەبات!

**٥- گژوگیای سروشتی زیانی نییە:** ئەم بۆچوونەش هەڵەیە، ڕەنگە زۆرجار ئەم وشەیەمان بیستبێت، بەداخەوە تەنانەت هەندێجار لە پزیشكانی دەرمانسازەوە دەبیسترێت، دەڵێن ئەم دەرمانە لە گژوگیای سروشتی پێكهاتووە، ئەگەر سوودی نەبێت، دڵنیابە كە هیچ زیانێكی نییە!

لە ڕاستیدا هەندێك گژوگیا ژەهراوییە، هەندێك جۆری دیكەی گژوگیا دەبێتە هۆی حەساسیەت بۆ هەندێك كەس!

هەندێك گژوگیا لە ماددەیەكی كیمیایی پێكهاتووە، هەروەكو دەرمانە كیمیاییەكان، بەڵام دەستكرد نییە، بەڵكو سروشتییە!

**٦- سابوون پاكژكەرەوەو پاكەرەوەیە:** ئەو بۆچوونە هەڵەیە، سابوونی ئاسایی پاككەرەوەیە، بەڵام پاكژكەرەوە نییە، واتە ناتوانێت میكرۆبەكان لەناوبەرێت، ئێستا لە بازاڕەكاندا جۆرەها سابوون هەیە كە ماددەی پاكژكەرەوەی بە وێنەی دیتۆڵو لای بۆی تێدایە.

**٧- زۆر خواردنی خواردەمەنی شیرینو پڕ شەكر، دەبێتە هۆی نەخۆشی شەكرە:** نەخۆشی شەكرە لە ئەنجامی تێكچوونی خانەكانی پەنكریاسەوەیە، یان چالاك نەبوونی ڕێژەی دەردانی مادەی ئەنسۆلین لە ناو لەشدا.

هەروەها چەند هۆكارێكی دیكەش هەیە بۆ تووشبوون بەو نەخۆشییە، بۆ نموونە بۆماوەیی، بەڵام خواردنی شیرینی لەو هۆكارانە نییە.

**٨- گا بە بینینی ڕەنگی سوور هار دەبێت:** گا وەك هەموو گیاندارە شیردەرەكانی دی ڕەنگی سوورو خۆڵەمێشی دەبینێتو تەنها ژمارەیەكی كەم لە ڕەنگەكان جیادەكاتەوە، بەڵام بە شێوازی جووڵەی گاڵتەجاڕی كێبەڕكێكارەكە هاردەبێت.

**٩- میوە دوای خواردن بەسوودە:** هەڵەیە، خواردنی میوە لە كۆتایی خواردندا ڕژێنی ئیتالین لە ناو دەبات، كە ڕژێنێكی سەرەكییە بۆ تەواوكردنی كرداری هەرسی نیشاستەمەنییەكان، خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ وَفَٰكِهَةٍ مِّمَّا يَتَخَيَّرُونَ (٢٠) وَلَحْمِ طَيْرٍ مِّمَّا يَشْتَهُونَ (٢١) ﴾ سورة الواقعه.

سەرەتا ئایەتە پیرۆزەكە بە میوە دەستی پێكردووە، پاشان بە خواردن، ئەمەش ئیعجازێكی زانستی قورئانی پیرۆزە، لەبەرئەوە پێویستە چاودێری ڕێساو بنەمای خۆراك بكرێت، لە خواردندا هەروەكو یەكێك لە ڕاوێژكارانی بواری خۆراك دەڵێت: خواردنی میوە لە كۆتایی خواردندا دەچوێنرێت بە خواردنی ژەهر.

هەروەها ڕۆژنامەی ئەهرام لە وتارێكیدا دەڵێت: میوە پێویستی بە ڕۆیشتنی هێواش هەیە بۆ گەدە، تا بەشێوەیەكی سروشتی هەرس ببێت، بەڵام كاتێك میوە بە گۆشت دەگات لە نێو گەدەدا، دەگۆڕێت بۆ ماددەیەكی كحولی، كرداری هەرس گران دەكات، لە هەمان كاتدا میوەكە سوودەكانی بە هەموو ڤیتامینییەكانەوە ون دەبێت، كرداری لێكچوواندنی خۆراكی بۆ پرۆتین تێكدەچێت.

لە كۆتاییدا ئەو ڕاوێژكارەی بواری خواردنو تەندروستی گشتیو بەرگری جەستە، ئامۆژگاریمان دەكات كە لانی كەم سێ كاتژمێر دوای خواردن میوە بخۆین، یان كاتژمێرێك پێش خواردن، یا لەو ژەمە خۆراكەدا تەنها میوە بخۆین!

# گومانبردن

پەیمان غەمگین

بەشی دووەم

وەك لە بەشی یەکەمدا باسمان کرد، گومان ئەو هێرشە توندەیە، کە لە لایەن هەستەوە بارگاوی دەبێت، پاشانیش بۆ دەربڕینەکانمان، ئەگەرچی وەك خۆی ناتوانین هەموو ڕیشەکانی هەڵبکۆڵینو سەری هەموو پێکهاتەکانی بۆ لێکدانەوەکانمان بوروژێنین، بەڵام دەتوانم بڵێم: توانیومانە لەوە تێبگەین کە گومان چییە؟ چی لێ دەکەوێتەوە؟ هۆکارگەلێك هەن کە شاراوەنو دەستیان هەیە لە دروستکردنی ئەو هێرشانە، بۆ سەرلێکدانەوەکانمان، ئێمەش هەستیان پێناکەین، یان ئەگەر هەستیشیان پێ بکەین، ناتوانین بەریان پێبگرین، وەك ئەوەی هەموو ژیانت لەگەڵ کەسێك بێت، دوایی بە هەموو متمانەوە گومانی لێبکەیت، واتا لەبەر زۆر بوونو کەڵەکەبوونی متمانەکان، گومانێك سەرهەڵبداو بتخاتە ژێر لێکدانەوەی خراپو گوماناوی، لە کاتێکیش نەتوانی پشتگیری لە هیچ بیرۆکەیەکت بکەیت، بۆئەوەی گومانەکانت بڕەوێنەوە. ئەمە ئەو جەنگە توندەیە کە ژیانی زۆرێکمانی خستۆتە مەترسییەوە. لە نێوان هەرتاکێکمان ڕۆژانە چەندین گومان زاوزێ دەکات، نەوەی نوێ دەخاتەوە، بۆ نێو بیرۆکەکان، هەر ڕۆژەو بە جۆرێك گومانێکی نوێ دێتە ژیانمانەوە، چەند کەس بناسیتو چەند ناسراو بیت، زیاتر کەسێکی گوماناویی دەبیت، هەرچەند کەسێك بیت هاوڕێی زۆرو تێکەڵاوی زۆرت هەبێت لەگەڵ تاکەکان، گومانەکانت زیاتر دەبێت. بە پێچەوانەشەوە هەرچەند کەسێکی کەم گەڕۆکو دوورە پەرێز بیت، کەمتر دووچاری گومان دەبیت.

ئەمەش لە کاتێکدایە، ئەو کەسانەی زۆر لە نێو نهێنییەکانی خەڵکیدا پیاسە دەکەنو نهێنی زۆریان هەڵگرتووە، تووشی شۆکی تایبەت دەبن، سەبارەت بە خوێندنەوەی کەسایەتییەکان، لەگەڵ تێکەڵ بوونیان بە چەندەها کێشەو پێشهاتەکانی دونیاو بوونی گەیەنەری ڕاستەوخۆو ئاگانامەکانو تێکەڵاوبوون لە ڕووداوی زیندوودا وا دەکات بیر بکەیتەوە کە هەموومان مرۆڤینو ئەگەری ئەوە هەوە هەیە کە هەڵخەڵەتێین، لەمەشەوە دەگەیتە چەند پرسیارێك کە ناتوانیت لێکیان بدەیتەوە، وەك ئەوەی گومان دەبەیت کە دەبێت خێزانت، یان کەسە خۆشەویستەکانت، یاخود هاوڕێو دۆستەکانت، لەوجۆرە کەسانە نەبێت کە تۆ لە بەسەرهاتەکاندا بینیووتە، دوای ئەوەی ناتوانیت لێکدانەوەیەکی تەواو بکەیتو سەرەنجام هێرشی گومان دەست پێدەکات، ئیدی کەسەکە بە گومانەکانی خۆیەوە خێزانەکەی خۆی دەخاتە نێو کێشەوە، هاوڕێکانیش یەکدی لە دەست دەدەن، چونکە بە هۆی گومانەوە داوای ڕوونکردنەوەی لێدەکاتو بەرامبەریش هەست بە کەمی دەکاتو وادەزانێت متمانەی پێ نەماوە. لێرەدا پەرچەکردارێك دێتە ئاراوە، ئەم لە ڕقی ئەو، ئەو لە ڕقی ئەم، گومانەکان هێرشەکانیان فراوان دەکەن بۆ سەر هەردوو لا، پاشان لێکترازان دروست دەبێت، ئەمە هەموو ناوەڕۆکەکە نییە کە دەمویست بیخەمە ڕوو، بەڵکو بەشێك بوو لەو ڕووداوانەی کە بە هۆی گومانەوە سەرچاوە دەگرن.

ئەگەر کەسێك هیچ ڕووداوێك نەبیستێ، لە ماڵەوەش نەیەتە دەر، لە هیچ شتێکی دونیا ئاگا دار نەبێت، ئایا



دەكرێت ئەو كەسە كەسێكی گوماناوی بێت؟

لە وەڵامدا دەڵێین: ناتوانین بڵێین گومانێكی لە دڵدا جێگیر نییە، چونكە هەر كەس هەستی هەبێت ئاماژەی گومان بردنیشی دەبێت، بەڵام دەتوانین بڵێین: كەمترین گومان لە خۆی هەڵدەگرێت، چونكە تاكە هۆكاری گومانبردن ئەو ژینگە كۆمەڵایەتییەیە كە تیایدا دەخولێینەوە، هەرچەندێك ژینگەیەكی پیس بێت، بە ڕووداوی لەو بابەتە كاریگەری زیاتری دەبێت بۆ دەوروبەر، من ڕەخنە لە هەموو ئەو كەناڵانە دەگرم كە بەرنامەی لەو شێوەیە پەخش دەكەن، بۆ نموونە لەگەڵ ڕێزم هێندێك كەناڵ هەڵدەستن بە دروستكردنی سیناریۆو لەم ڕێگایەشەوە ناوی دەنێن ڕووداوی ڕاستەقینە، حكومەتیش لێی بێدەنگە، دوای دابەزاندنی ڕووداوە شێوێنراوەكە، چەندین گومان بۆ بینەر جێ دەهێڵێت، دوای ئەمە، دەبێتە هۆی ئەوەی خێزانەكان خێزانێكی گوماناوی بن بەرامبەر بە یەك، لە پاڵ ئەوەی خێزانی یەك هەڵوێستی، برا گومان لە خوشكی دەكات، برادەر لە هاوڕێكەی‌و باوك لە كوڕو كچەكانی، مامەڵەچی لە مامەڵەكانی، هەموو ئەو گومانانە وا دەكەن كێشەكان پەلكێش بن‌و دووبارەببنەوە، ئەگەر بێت‌و ئەو ڕووداوانە بەڕاستی‌و درۆیەوە پەخش نەكرێن بۆ بینەر، زۆر ئەرێنی ترە، بۆ دوورخستنەوەی گومان لە هەمووومان.

بۆچی دەڵێن: ئێستا سیقەو متمانە بە یەكتر نەماوە؟ لە كۆندا سیقەو متمانە بە یەكدی زۆر بوو؟

لە وەڵامدا دەڵێین: هەموو ئەوەی باسمان كرد دەستیان هەیە لە نەمانی متمانە بە یەكتر، جاران تەكنەلۆجیا لەوپەڕی دواوە لە ئێمەدەگوزەرا، ئێستا زۆر جیاوازە، هەموومانی نوقمی نەهامەتییەكانی كردووە، چونكە زۆر بە نارێكی ئەو تەكنەلۆجیایانە بەكاردەهێنین، كە ناویانراوە تەكنەلۆجیای سەردەم، لە هەمان كاتدا جۆری بەكارهێنراوەكان لە لای ئێمە لەوپەڕی پێشێلكارییەوە خۆی دەبینێتەوە، هەموو ئەو هۆكارانەش وادەكەن، هەرچی سیقەیە بەرەو كەمترین خاڵ بڕوا، لە پاڵییەوە گومانەكان لە لوتكە دابن!

# ژیان فێری كردم

ژیان فێری كردم: تەنانەت لەگەڵ دوژمنەكەشمدا ڕاستگۆبم!

ژیان فێری كردم: تاڵیش بە شیرین ببینم!

ژیان فێری كردم: پێویستە چاك بم لەگەڵ ئەو كەسانەشدا كە خراپن لەگەڵمدا!

ژیان فێری كردم: بە زۆری ئەو كەسانەمان خۆشدەوێت كە لێمانەوە دوورن!

ژیان فێری كردم: مرۆڤی ژیر كەم قسە دەكات، كاتێكیش قسە دەكات، ڕاستی دەپێكێت!

ژیان فێری كردم: مرۆڤی ئازادو سەربەست، گەر ڕێزی خۆی نەگرت، دەبێتە كۆیلەو بەندەی كەسانی دی!

ژیان فێری كردم: ڕووخساری زەردەخەناوی‌و ڕووخۆشی، كلیلی هەموو دڵێكە!

ژیان فێری كردم: زیادەڕەویی كردن لە سوعبەت‌و گاڵتەو گەپدا، دەبێتە هۆی لە دەستدانی ڕێزی خاوەنەكەی!

ژیان فێری كردم: مامەڵەی جوان‌و چاك‌و ڕەفتاری جوان، دەرمانی هەموو ڕق‌و كینێكە!

ژیان فێری كردم: دڵ‌و سینەم پاك بكەمەوە بەرامبەر بە كەسانی دەوروبەرم، بۆئەوەی بەرهەمەكەی لە دنیاو دوارۆژدا بدوورمەوە!

ژیان فێری كردم: نهێنییەكانت، دیل‌و بەندەی خۆتن، ئاگاداربە لای هیچ كەس نەیاندركێنیت، چونكە ئەو كات تۆ دەبیتە دیل‌و بەندەی نهێنییەكانت!

ژیان فێری كردم: هەرگیز تف نەكەمە هیچ بیرێكەوە، چونكە ڕۆژێك دادێت ئاوی لێبخۆمەوە!

ژیان فێری كردم: كاتەكانی خۆم بە فیڕۆ نەدەم، لەگەڵ كەسێكدا كە نایەوێت قسەم لەگەڵدا بكات، هەروەها قسەش نەكەم لەگەڵ كەسێكدا، كە گوێیەكانی داخستووە!

ژیان فێری كردم: ژیان بە ویژدانەوە لەبەر ڕووناكی مۆمێكدا، زۆر باشترو ڕێزدارانە ترە، لە ژیان بە بێ ویژدان لەبەر چراخانی كۆشك‌و تەلارە بەرزەكاندا!

ژیان فێری كردم: جوانی، بەبێ ئاكارو ڕەوشتی بەرزو جوان، وەكو گوڵی بێ بۆن وایە!

ژیان فێری كردم: نە لە خۆشەویستی و نە لە ڕق‌و كینەدا زیادەڕەویی نەكەم، ڕەنگە ڕۆژێك دابێت ئەو هاوڕێیەی ئەمڕۆ زۆر خۆشت دەوێت، ببێتە ناحەزت، لەوانەشە ئەو كەسەی ئەمڕۆ زۆر ڕقت لێیە، ببێتە دۆستت!

ژیان فێری كردم: مرۆڤ نازانێت ژیان چەندە كورتە، مەگەر ئەو كاتە نەبێت كە لە سەرەمەرگدایە!

ژیان فێری كردم: ئەگەر بۆ جارێكیش بێت لە تەمەنمدا سەردانی زیندان‌و زیندانییەكان بكەم، بۆئەوەی قەدری نیعمەتی ئازادی‌و سەربەستی بزانم، هەروەها ساڵانە جارێك سەردانی دادگا بكەم، بۆئەوەی قەدری ئاكارو ڕەوشتی جوان بزانم، هەموو مانگێك سەردانی نەخۆشخانە بكەم، بۆئەوەی قەدری لەشساغی‌و تەندروستی بزانم، هەفتانە سەردانی باخچەیەك بكەم، بۆئەوەی قەدری جوانی‌و ڕازاوەیی سروشت بزانم، ڕۆژی جارێكیش سەردانی كتێبخانە بكەم، تا قەدری ژیری‌و دانایی بزانم!

ژیان فێری كردم: سەركەوتووەكان، ئەو كەسانەن كە دەتوانن هەلەكان بقۆزنەوە!

ژیان فێری كردم: ئاوی زۆرو بەخوڕ، هەرگیز بۆ دواوە ناگەڕێتەوە.

ژیان فێری كردم: مرۆڤ بەبێ ئاكاری جوان، وەكو درەخت وایە بەێ گەڵا، نە ڕەنگی هەیەو نە بۆنی هەیەو نە تام!

ژیان فێری كردم: مرۆڤ بەبێ هیواو ئاوات، وەكو جەستەیەكی بێ گیان وایە، ئەو هیواو ئاواتەش، كە مرۆڤ كارناكات بۆ بەدیهێنانی، وەكو ئەو خونچەیە وایە كە دەوەرێت، پێش ئەوەی مرۆڤ چێژی لێببینێت.



# پەیوەندیەو متمانە لای منداڵ

شاگوڵ عوسمان حوسێن

پەروەردەکردنی منداڵ دەبێت گۆشەیەکی تایبەت بێت لای خێزانو خۆ ئامادەکردنی بۆ بکرێت، منداڵ پێکهاتەیەکی پڕ لە ڕەحمەتەو لە لایەکی ترەوە پەروەردەکردنی لەم ڕۆژگارەدا یەکجار سەختو زەحمەتە، یەکێك لە بنەما سەرەکییەکانی توانای فێرکردن، بریتییە لە خۆڕاگریو نەرمونیانی، تەنها چەند پێشنیارێك دەخەینە ڕوو بۆ بەهێزکردنی پەیوەندی لەگەڵ منداڵو دروستکردنی متمانە لە لای، گەر کارێك نەسپێریت، ناتوانرێت متمانە بەدەست بهێنرێت، پێش متمانەکە پێویستمان بە پەیوەندییەکی زیندوو بەهێزە.

* هەمیشە وەسفی لایەنی باشی بابەتەکان بکرێت بۆ منداڵ، تا قەناعەتی لادروست بێت، باشترین هۆکار بۆ قەناعەت بریتییە لە بەکارهێنانی جێگرەوە (بدیل)، تایبەتمەندی منداڵ زۆر گرنگە، بۆ نموونە منداڵی یەکەم تازە چووەتە قوتابخانە بووە، پێویستە تایبەتمەندییەکانی ئەو قۆناغە لەبەرچاو بگیرێت، بەڵام هەندێجار خێزان چەند تایبەتمەندییەکی منداڵی یەکەم دەخوێنێتەوە، ئەوەندەش هی دووەم، کە هێشتا لە باخچەیە، بە بیانووی ئەوەی نایەوێت جیاوازی بکات، هەوڵ بدرێت قەناعەت بە منداڵی دووەم بکرێت کە ئەو دەچێتە قوتابخانە، هیوایەکیشی پێ بدەی، کە ئەویش هەمان تایبەتمەندی دەبێت کاتێك دەچێتە قوتابخانە، تا منداڵی یەکەمیش متمانە لە دەست نەدات..

* هەوڵبدە کە هەرخۆتو منداڵەکەت دەبیت خۆشحاڵی بکە لە ئومێدی گەورەبوونی، چونکە ئەوان هەمیشە حەز دەکەن گەورەبنو پاشان پێی بڵێ تۆ ئومێدو هیوای منیت، تۆ خۆشەویستی منیت، کاریگەری زۆر باشی دەبێت لەسەر پەیوەندیو متمانەی منداڵ، پاشان هەندێك لەو شتانەی لەبەردەستاندایە بەڵێن بدە کە لە گەورەبووندا بۆ ئەو بێت، بەمەش بەردەوام هیواو ئارەزوویەکی بۆ دیاری دەکەیت، چونکە سەرەتا خێزانەکان دەستیان هەیە لە هیواو ئارەزووی منداڵ، وەك زەوییەك ڕادێت چی لەگەڵ خاکەکەی گونجاوە بۆ چاندن، یاخود کاتێك یاری دەکەن پێکەوە سەرەتاو کۆتایی یاری بۆ دیاری بکەو پاشان لە کۆتاییدا خۆت بچووك بکەرەوەو چاوەکانت ببڕە چاوە پڕئومێدەکەیو پێی بڵێ: کاتێك بە تەنهایت هەمیشە یاریو خۆشییەکانی نێوانمانت بیربێتو کە گەورە بوویت ئەم ڕۆژە خۆشانەت لە یاد بێت، ئەمە وادەکات گرنگی بدات بە بیرەوەری ڕۆژە خۆشەکانی.

* بۆنەکانی منداڵەکەت لە یاد بێت، بەڵام ساڵانە جیاوازی تێدا دروست بکە، دەتوانیت ساڵانە لە بری هەموو ئەو زیادەڕەوییەی لە ئاهەنگی لە دایکبوونیدا دەکرێت، دەتوانرێت هەر ساڵەو پێشنیارێکی پێ بدەیت. بۆ نموونە دەتوانیت باخچەیەکی بۆ ئامادە بکەیت،

یاخود نەمامەکانی بەردەرگای ماڵ بگریتە ئەستۆ، هەرساڵەو نەمامێکی تێدا بڕوێنیت، پاشان نیازی پێ بدە کە خۆی سەرپەرشتیاری کارەکە بگرێتە دەست، بەڵام بۆ پارێزگاریکردنی ئەم کارە، هەوڵ بدە تەنها ڕێنمایی (ئاماژە بۆ چۆنییەتی کارەکە) بدە، نەك فەرمانکردن بە کارەکە، یاخود ساڵانە ئەو دەستکەوتانەی هەیانە بەشێکی بۆ هاوکاری منداڵی هەژارو کەمدەرامەتو نەخۆشە درێژخایەنەکان، تەرخان بکەن، هەروەها دەتوانیت بە پێی وەرزەکان خێزان پێکەوە هەر کەس بڕیاری بەخشینی هەندێ لە جلو بەرگی خۆی بداتو ڕاستەوخۆ لە بەردەم کەنتۆردا کۆببنەوەو هەرکەس ئارەزووی چ جۆرە جلێکی هەیە بیبەخشێت، یان هەندێ لە یارییەکانیو پاشان لەم چالاکییەدا بەشداری بە منداڵەکەت بکەو پێکەوە بیگەیەننە شوێنی مەبەست..

بەخشین وانەیەکی زۆرگرنگە، جا چ بەخشینی مادی بێت، یان مەعنەوی، چونکە دەبێت قەناعەتی بەخشین وەك هەر بابەتێکی تری پەروەردە هەر لە منداڵییەوە دروست بکرێت، چونکە هەستێکە ناتوانرێت لە پڕ بێتەدی، بەڵکو دەبێت کاری لەسەر بکرێت، هەوڵ بدرێت جیاوازی ڕەگەزی منداڵ پەیڕەو نەکرێت لە ڕێکخستنو پاکڕاگرتنی ماڵو شوێنی تایبەت کە ئەمەش خواستێکی ژینگەییە.

* هەفتەی یەك ڕۆژ، منداڵەکەت سەرپشك بکە لە پۆشینی جلوبەرگی، ئەمە وا لە منداڵ دەکات، فێری سەلیقەی خۆگۆڕینو ڕێکپۆشی بێت، یاخود هەندێ منداڵ بێزارن بە خەوی نیوەڕوان، بە تایبەتی لە وەرزی هاویندا، دەتوانیت هەفتەی یەك ڕۆژ سەرپشکی بکەیت کە نەخەوێت، ئارەزوویەکی خۆی جێبەجێ بکات، پێویستە منداڵان جگە لە دیاریکردنی تەواوکردنی ئەکادیمیایەکی دیاریکراو، بە بابەتێکی تر شارەزایی لا دروست بکرێت، لێرەدا منداڵ تێدەگات ئارەزووەکانی دەخوێنرێتەوەو گرنگی پێدەدرێت. خوێندنەوە بۆ منداڵ هەوڵ بدرێت هەمیشە لە کاتی خەوتندا، یان لە نێو پێخەفدا نەبێت، وەك بەرێزێك دەڵێت: (ئەوە وا لە منداڵ دەکات، هەر کات کتێب بگرێت بەدەستییەوە خەوی دێت)، ئەمەش لە داهاتوویدا کێشەی بۆ دروست دەکات، بە شداریکردنی منداڵ لە ژماردنی شتێکی بەرجەستەیی بۆ نموونە کیسەیەك گوێز، یان دروستکردنی ملوانکەیەك بۆ خۆی، منداڵ لێرەدا فێری ئارامیو بەردەوامی دەبێت..

* هەوڵ بدە سزاکان ڕووخساری نەبن، هێندەش سزایەکی سەختی مەدە کە بەدرێژای ژیانی بیری نەچێتەوە، یاخود یارییەك، یان هەرشتێکی تری کە خۆشی دەوێت، ڕەنگە لای ئێمە سادەبێت، بەڵام لای منداڵ تایبەتمەندی خۆی هەیە، ئازاری مەدە بە لە ناوچونی ئەو شتە، جارجارە لە هەڵەی منداڵ چاوپۆشی بکرێت، واخۆت نیشان بدەیت کە نەتزانیوە، یان شکاندنی شتی ناوماڵ، دەبێت فێری بکەیت ئاگادارت بکاتەوە کە شکاندوویەتی، بەڵام بە بێ سزا لێی خۆشبە، ئەمە منداڵ وا لێدەکات هەڵە بوونی هەیەو متمانەی بە خێزان هەیە، گەر بیگێڕێتەوە سزاش نادرێت. زۆرجار دەمانەوێت منداڵ گوێڕایەڵیمان بکات، ئێمەش لە کەم ئەزموونی خۆمان وادەزانین دەبێت هەر ئامۆژگاری بکرێت، کە هەندێجار لە زۆر ئامۆژگاری کردندا منداڵ لاسار دەبێت، دەڵێن: بە منداڵەکە گەر فلان کار نەکەیت گوێت دەبڕم، هەوڵ بدە سزاو کار بە یەکەوە مەبەستەرەوە، سزا دوای نەکردنی کار ئامادە دەکرێت، گەر سزایەك گونجاو بکرێت، ڕەنگە کارەکەش نەکاتو تۆش ناتوانیت ئەو سزا قورسەی بدەیت! لە پێناو ئەنجامدانی ئیشوکاری ماڵ، منداڵ سزا مەدەو مەرجی پێ مەدە، بەڵام دەتوانیت فێری هاریکاری بکەیت، چونکە منداڵ ناچار نییە کار بۆ ماڵ بکات، جا لە ناو، یان دەرەوەی ماڵ بێت، بۆ یەك هەڵەش چەند سزایەکی مەدە، بۆ نموونە منداڵ جوێن دەدات، پێتناخۆشەو لێی توڕە دەبیتو ئازاری جەستەی دەدەیت، پاشان ناچاری دەکەیت نەگریو نەجوڵێت، لە سێ جار زیاتر هەوڵبدە هەڵەکە نەڵێیتەوە بە ڕوویدا، ئەوەی دەتەوێت ئاماژەی پێ بدە نەك ئەوەی ناتەوێت.

هەوڵ بدە هیچ کات ناوناتۆرە لە هیچ منداڵێك نەنێیت، ڕەنگە منداڵی یەکەم کەم دووبێتو منداڵی دووەم ڕووخۆشو قسەخۆش بێت، ئەوا ئاماژە بەوە مەدە کە منداڵی یەکەم گێژەو منداڵی دووەم چەنەباز، پێکهاتەی خۆگونجاندنی منداڵ جیاوازە، گەورەکان بێزاردەبن کە منداڵەکان قسەیان پێ ببڕن، بەڵام جارێك هەقی پێ بدەو ڕووخسەت لە گەورەکان بخوازە لە پێناو گوێگرتن لە منداڵەکان، یاخود زۆرجار بێزار دەبین لە دەنگە دەنگیان، کە چی ئێمە هاواردەکەین بە سەریانداو دەنگ بەرزدەکەینەوە، لە پێناو بێدەنگی منداڵدا دەتوانیت ئەوەی خۆت دەیڵێیت لە پێشدا خۆت جێبەجێی بکەیت، بە بێدەنگیو بە زمانو ڕوویەکی خۆشەوە پێی بڵێ دەتوانی بە دەنگی نزم بدوێی؟!

* خاڵێکی زۆرگرنگتر دەمەوێت بە کورتی ئاماژە ی پێ بدەم، ئەو منداڵانەی کە دایك، یان باوکیان نەماوە، یاخود بە هەر هۆکارێکی تر جیابوونەتەوە، دڵنیام ئێمە بۆ یەکەمیان بەزەییمان هەیە، بەڵام بۆ دووەمیان جۆرێك نادروست لێیان دەڕوانین، کە ئەمەش بۆچوونێکی هەڵەیە، چونکە منداڵ هەرگیز دەستی نییە لە بڕیاری گەورەکاندا، دەبێت ئەوە باش بزانین کە هیچ کات نابێت باگراوندی دایكو باوك بکێشینەوە بۆ منداڵ، دەبێت هەوڵ بدەین وەك منداڵی ئاسایی ڕەفتاریان لەگەڵدا بکەین، زۆرجار کەسوکاری دەوروبەری ئەم دووکۆمەڵە منداڵە لە دڵسۆزیو خەمخۆریان بۆ ئەو منداڵانە ڕاستەوخۆ تەدەخولی پەروەردەی منداڵەکە دەکەن، بەڵام دروستتر وایە دڵسۆزی خۆیان لە ڕێی بەخێوکەرەوە ئاگاداربکەینەوە، تا هاوسەنگی منداڵ نەشێوێت، چونکە منداڵ تووشی شۆك دەبێت، لە واقعێکدا دەژی لە بری دایکێك چەند دایکێکی هەیەو لە بری باوکێك چەند باوکێکی هەیە، منداڵ هەست دەکات سنورەکانی تێکشکاوە، بۆیە هەندێجار ئەم منداڵانە لە داهاتوودا کەمتر پەروەردەیان پێوە دیارە، بەڵام دەتوانرێت بەشدارییان پێ بکرێت لە خێرو خۆشی منداڵەکانی تردا و بەچاوێکی پڕئومێدیشەوە لەوان بڕوانین، لە ڕێی دەستی خێری خۆمانەوە، (جوانترین نموونەش کاتێك ئەبوتالیب هەموو پەروەردەو فێرکردنی پێغەمبەری (درودی خوای لێبێت) گرتە ئەستۆ، قوڕەیشییەکان هەر کارێکیان بە دڵ نەدەبوو، دەچوونە لای مامیو مامیان ڕادەسپارد، یان هەروەك پێغەمبەر زەکریا (سەلامی خوای لێبێت) هەموو پەروەردەو چاودێری خاتوو مەریمی گرتە ئەستۆ سەلامی خوایان لێ بێت)، گونجاوترە یەك کەس بەرپرسیارییەتییەکەی بگرێتە دەست، تا سنوری خێزانی ئەو منداڵە نەشێوێت.

هیوای نەوەیەکی دروستو پڕ لە سەروەری دنیاو دین، بۆ هەموو لایەك دەخوازین.



# ئەو سیفەتانەی پیاو حەز دەکات لە هاوسەرەکەیدا هەبێت!

ئا: بەرزان ئەبوبەکر

لە ژمارەی ڕابردوودا باسمان لەو سیفەتانە کرد، کە ئافرەتان حەزدەکەن لە هاوسەرەکانیاندا هەبن، لەم ژمارەیەدا باس لەو سیفەتانە دەکەین کە پیاوان حەزدەکەن لە هاوسەرەکانیاندا هەبێت، گەر ئافرەتو پیاو بتوانن خۆیان بەم سیفەتانە برازێننەوە، ئەوا بێگومان دەتوانن ببنە خێزانێکی بەختەوەرو شادمانو ئاسوودەو بەسوود بۆ خۆیانو منداڵەکانیانو دەوروبەریان، بەو هیوایەی بتوانین خۆمان بە هەموو ئەم سیفەتە جوانانە برازێنینەوە..

**١- گوێڕایەڵو نەرمو نیان لەگەڵ هاوسەرەکەیدا، بەهێزو بە توانا لەگەڵ کەسانی دیدا:**

پیاو بە سروشتی خۆی حەزدەکات هاوسەرەکەی کەسێکی نەرمو نیانو گونجاوو گوێڕایەڵ بێت لەگەڵیدا، هەروەها حەزدەکات هاوسەرەکەی تەنها لەگەڵ ئەودا خاوەنی ئەم سیفەتانە بێت، لەگەڵ کەسانی دەوروبەردا کەسێکی بەهێزو بە تواناو خاوەن کەسایەتییەکی ناوازە بێت، پیاو بەم سیفەتە زۆر شادمان دەبێتو هەست دەکات هاوسەرەکەی ڕێزی لێدەگرێتو مافەکانی جێبەجێ دەکاتو کاروبارەکانی بۆ ئاسان دەکات، چونکە ئەم سیفەتە نیشانەی خۆشویستنی ئافرەتە بۆ هاوسەرەکەی، بە هۆی بەهێزی کەسایەتییەوە لە پەروەردەکردنی جوانو دروستی منداڵەکانیدا، یارمەتی دەدات...

**٢- دیندار:** بێگومان دینداری یەکەمینو گرنگترین سیفەتە بۆ هەردوولا، هەروەکو پێغەمبەر (سەلامی خودای لێبێت) دەفەرموێت:

(تنكح المرأة لأربع: لمالها ولحسبها وجمالها ولدينها فاظفر بذات الدين تربت يداك).

واتە: ئافرەتان بۆ چوار شت خوازبێنی دەکرێن: لەبەر سەروەتو سامان، بنەماڵەو پلەوپایە، جوانی، دینداریو پابەندبوونی بە ئایینەوە، با تۆ خوازبێنی کردنەکەت لەبەر دینداریو پابەندبوونی بێت بە ئایینەوە، دەستت دەچێت بەخۆڵا، واتە: بەرەکەتت بە سەردا دەڕژێت!

لەبەرئەوەی دین، مرۆڤ بنیاد دەنێت، هەموو خێرێکی تێدا کۆدەکاتەوە، مرۆڤ دەکاتە کەسێکی ئاکار بەرزو ڕەوشت جوان، دیندار ئەمینو باوەڕپێکراوە، پارێزەریماڵو ئابڕو منداڵی هاوسەرەکەیەتی، لە کاتی بوونو نەبوونیدا.

**٣- جوانی:** ئاساییە گەر پیاو حەزبکات هاوسەرەکەی جوان بێت، بەڵام جوانی لای هەر پیاوێك مانایەکی هەیە، بە پێی سروشتو ژینگەی پیاوەکە دەگۆڕێت!

**٤- هاوسەری چاك:** چاکی هاوسەر، وشەیەکە بە واتای کۆکەرەوەی هەموو سیفاتە جوانو نایابەکان دێت، چینییەکان دەڵێن: ئافرەتی چاك بۆ پیاو، لە دەستو قاچ پێویسترە، بەڵام ئەمریکییەکان لەبەرئەوەی هەموو شتێك بە پارەو سامان لێکدەدەنەوە، سەبارەت بە ئافرەت دەڵێن: ئافرەتی ڕووخۆش، یەکسانە بە یەك ملیۆن دۆلار، ئافرەتی جوان، یەکسانە بە سێ ملیۆن دۆلار، ئافرەتی چاك، یەکسانە بە هەموو بودجەی ئەمریکا!

**٥- تەندروستو ڕووخۆش:**

پیاو حەز دەکات هاوسەرەکەی خاوەنی ئەم سیفاتە بێت، چونکە بەردەوام بەختەوەریو شادمانی بە ژیانی دەبەخشێت، لە خەمو پەژارە دووری دەخاتەوە، خێزانی باش، هاوڕێو هاوکارو دۆستو خۆشەویستی هاوسەرەکەیەتی، ئافرەت دەتوانێت بە ئەرێنی، یاخود نەرێنی کاریگەری هەبێت لەسەر میزاجی هاوسەرەکەی.

**٦- شەرمنی:** شەرمنی جوانی ئافرەتە، ئافرەت بەبێ ئەم سیفەتە دەبێتە کەسێکی نەخوازراوو ناشیرین، هەرچەندە لە شێوەو ڕووخساریشدا جوان بێت، چونکە ئەگەر ئافرەت خاوەنی ئەم سیفەتە، واتە شەرمن نەبوو، ئەوا بە کەسێکی بێ چاوەڕوو خراپو زمان درێژ وەسف دەکرێت.. ئەگەر مرۆڤ بە گشتی شەرمی نەکرد، ئەوا ئامادەیە هەموو خراپەیەك بکات.

**٧- جوان گوێگرتن:** پیاو حەز دەکات هاوسەرەکەی بە باشی گوێی بۆ بگرێت،

هەرگیز قسەکانی پێنەبڕێت، کاتێك قسەی بۆ دەکات، خۆی بە شتی دیکەوە سەرقاڵ نەکات، بەڵکو سەرنج بداتە قسەکانیو بە زەردەخەنەو گرنگییەوە بۆی بڕوانێت، وەکو ئەوەی کە هاوسەرەکەی گرنگترینو باشترینو جوانترین کەسە بە لایەوە.

٨- گرنگیدان بە هاوسەر:

پیاو حەز دەکات هاوسەرەکەی گرنگی پێبدات، بە جۆرێك کە نە منداڵو نە ئیشوکارو نە کاروبارەکانی نێوماڵو نە هیچ شتێکی دیکە، وای لێنەکات هاوسەرەکەی فەرامۆش بکات، ئافرەتی چاك، ڕازیکردنو دڵخۆشکردنی دڵی هاوسەرەکەی لە پێشینەی کارەکانیدا دادەنێت.

٨- خۆڕازاندنەوەو شۆخو شەنگی:

پیاو زۆر حەز دەکات هەمیشە هاوسەرەکەی شۆخو شەنگو ڕازاوە بێت، زۆر ڕقی لە ئافرەتێکە کە تەنها بۆ دەرەوەی ماڵ خۆی جوان دەکاتو لە بەردەم هاوسەرەکەیدا خۆی فەرامۆش دەکاتو گوێ بە خۆی نادات، پیاو حەز دەکات هاوسەرەکەی جوانترین پۆشاك بۆ ماڵەوە لەبەر بکاتو بەردەوام لە نێوماڵدا گرنگی بە خۆڕازاندنەوەو پاکو خاوێنیو خۆبۆنخۆشکردن بدات..

نەك وەکو زۆرێك لە ئافرەتانی ئەمڕۆ، بۆ دەرەوەی ماڵ بە جۆرەها شێواز خۆیان دەڕازێننەوەو لە ماڵەوەش بە تەواوی خۆیان فەرامۆش دەکەن، لە ڕاستیدا ئەمە سیفەتێکی زۆر نێگەتیفەو پیاو یەکجار بێزارو هەراسان دەبێت بە بوونی ئەم سیفەتە لە هاوسەرەکەیدا!

٩- ڕێزگرتن لە کەسوکاری هاوسەر:

بە لای پیاوەوە کەسوکارەکەی جێگەو مەنزڵی تایبەتی هەیە، حەزدەکات هاوسەرەکەی ڕێزیان بگرێتو خۆشی بووێن، هاوسەری ژیر، بە ڕێزگرتن لە کەسوکاری هاوسەرەکەی خۆشحاڵو شادمان دەبێت، چونکە ئەگەر کەسێك لەگەڵ کەسوکارەکەی خۆیو هاوسەرەکەیدا چاك نەبێت، ئەوا بێگومان ناتوانێت بۆ کەسانی دیش چاك بێت.

١٠- هۆشیاریی: پیاوێك نییە لەم دنیایەدا ئافرەتی نەزان بە چاك بزانێت، مەگەر کەسانێکی دەگمەن نەبێت، پیاوی ژیر ئافرەتی ڕۆشنبیرو هۆشمەند کە خاوەنی ژیرییەکی ناوازەو دووربینییە هەڵدەبژێرێت، پیاو حەز بە ئافرەتێك ناکات کە بڕوای بە خورافاتو درۆو دەلەسە هەبێت، چونکە ئەم جۆرە ئافرەتە، هەر ڕۆژەو لە دەرگای فاڵچییەك دەدات بۆ بە دەستهێنانو خۆخۆشەویستکردن لای هاوسەرەکەی، بەڵام ئافرەتی ژیرو داناو ڕۆشنبیر، بە کردەوەی باشو ڕەفتاری جوانو ئاکاری بەرز، خۆشەویستی هاوسەرەکەی بە دەستدەهێنێت، هەمیشە هەوڵ دەدات لە هاوسەرەکەی تێبگاتو هەرگیز لە وتەکانی بێزار نابێت.

١١- نوێبوونەوە: ئەگەر پیاو بێتاقەتو ماندوو خەمبار بوو، ئەوا هاوسەرەکەی لێوەی دوور نییە، لەبەرئەوە بەردەوام جلوبەرگی نوێو قسەی خۆشو زانیاری نوێی پێدەبەخشێت، پیاو هاوسەرەکەی ناچارناکات کە هەموو ڕۆژێك ڕووکەشی نوێ بکاتەوە، بەڵکو ڕۆحو هەستو دەربڕینەکانی پێویستی بە نوێبوونەوەی بەردەوام هەیە، تا بتوانێت ببێتە خەمڕەوێنو یارمەتیدەری هاوسەرەکەی، هاوکاری بێت بۆ چارەسەرکردنی کێشەکانی، ئافرەتی چاك خەمو پەژارە لەسەر هاوسەرەکەی لادەبات، ئافرەتی خراپیش خەمی بۆ زیاد دەکات.

١٢- سەرنجڕاکێش:

شتێك کە وەسف ناکرێتو زۆر جێگەی بایەخە لە لای پیاو، سەرنجڕاکێشانە، سەرنجڕاکێشان سیحری کەسایەتی هەر کەسێکە کە هەموو مواسەفاتی ڕووخسارو ڕۆحیو کۆمەڵایەتیو ڕۆشنبیری تێدا کۆبووەتەوە، سەرنجڕاکێشان شتێکە لە تەنها سیفاتێکی دیاریکراودا خۆی نابینێتەوە، خۆشەویستی سیفەتێکە سەرنجی پیاو ڕادەکێشێت، هەموو پیاوێك کلیلێکی هەیە کە دڵی دەکاتەوە، دەرگای ئەو دڵەش خۆشەویستییە، ئافرەتیش لە هەموو کەس بە تواناترە بۆ کردنەوەی دەرگاری دڵی هاوسەرەکەی، ئەگەر لێهاتوویی‌و زیرەکی خۆی بخاتە کار.

لە کۆتاییدا دەڵێین: ئافرەتی چاك، جوانە، پەروەردەکارو فێرکاری منداڵەکانییەتی، خزمەتگوزاری هاوسەرو نەوەکانییەتی، دایکێکی نموونەییو بەسۆزو میهرەبانە بۆ منداڵەکانی، سەرپەرشتیاری ماڵە، خۆشەویستی هاوسەرەکەیەتی، دڵسۆزو بە وەفاو خەمخۆری ئایندەی منداڵەکانییەتی، ئەوینداری ڕاستەقینەی هاوسەرەکەیەتی، بە کورتی هاوسەرێکی نموونەییە، دروستکاری ماڵێکە، کە لێوان لێوە لە خۆشەویستیو ئارامیو بەختەوەریو ئاسوودەیی!

# پەیڤ

ئازاد محێدین

- نرخی وشە لە دەربڕیندایە
- نرخی دەربڕین لە ڕاستگۆییدایە
- نرخی ڕاستگۆیی لە دڵسۆزییدایە
- نرخی دڵسۆزی لە بڕیاردایە
- بەهای بڕیاریش لە کرداردایە
- جوانی کرداریش لە بێبەرانبەریدایە

# بابە گیان



هۆزان جەلیل حەمە سەلیم

خوای گەورە لە سەرەتای دروستبوونی ئەم ژیانەدا مرۆڤی نێرو مێی بەدی هێناوە، بەو ئامانجەی نەوەیەك بخەنەوە کە بەردەوامی بە ژیان ببەخشێت، ئەو نەوانە دەروازەیەك بن بۆ خۆشبەختی خۆیانو دایكو باوكو خانەوادەو ئەو ژینگەیەی ژیانی تیادا بەڕێ دەکەن، دڵنیام هەموومان کۆکین نەوەکان کاتێك دەبنە چرای خۆشبەختیو کامەرانی کە دایكو باوك بەشێوەیەکی دروست نەوەکانیان پەروەردە بکەن، چونکە کاتێك منداڵ دێتە ئەم ژیانەوە وەك پەڕەیەکی سپی وایە، هیچ سیفەتێکی ناپەسەندو نەخوازراوی لەسەر تۆمار نەکراوە، ئەوە دایكو باوكو مرۆڤەکانی هاوژینێتی کام کردارو کام سیفەت لە پەڕاوی هزری منداڵەکان تۆمار دەکەن، با هەموومان دڵنیابین چی ببەخشین بە پەڕاوی نەوەکان، لە داهاتوودا ئەوەش دەبەخشنەوە بە خۆیانو مرۆڤایەتی، وەك لە کوردەواریدا وتراوە مرۆڤ چی بچێنێت ئەوەش دەدوورێتەوە.

دایکانو باوکانی ئازیز.. زۆر دڵنیام کە ئەرکی سەرشانتان زۆر گەورەیە لە پەروەردەکردنی نەوەکانتان، چونکە لە ڕۆژگارێکدا دەژین ئەرکەکان ڕۆژ بە ڕۆژ سەختتر دەبێت، ئەو سەختییەش تەنها بە پەیداکردنی خواردنو پۆشتەکردنی نەوەکان نییە، بەشێوەیەك خواردنو جلوبەرگە گرانبەهاکان تەنها هۆکار بێت بۆ گەیشتن بەپایان، بەڵکو لەوەش سەختتر پەروەردەکردنیانە لە لایەنی کەسێتیو ژیرییەوە، گرنگە پێش ئەوەی گوێمان لە ناوی باوك بێت، با شارەزایی تەواومان هەبێت بۆ ئەرکو مافەکانمان، بەرامبەر منداڵەکانمان، چونکە چۆن بە ئەرکی سەرشانی منداڵەکانمان دەزانین ڕێز لە باوانیان بگرن، بە هەمان شێوەش با درك بکەین کە منداڵەکانمان مافیان هەیە بەسەر باوانیانەوە لە لایەنی بەخشینی هەستی خۆشەویستیو بنیاتنانیان بۆ کەسێتییەکی سەرکەوتوو.

ئەگەر نەوەیەك هەلگری سیفاتی شەڕەنگێزیو کاری ناپەسەند بێت، ئەوا با هەموو تاوانەکان نەوەکان خاوەنی نەبن، بەڵکو بەشێکی زۆری ئەو هەڵانەی نەوەکان دەیکەن دەرهاویشتەی ئەو پەروەردە هەڵانەیە کە لە باوانەوە، یان دەوروبەرەوە بە تێپەڕبوونی کات بۆتە بەشێك لە کەسێتیان، ئێستا دەیبەخشنەوە، ئێمەی نەوەی باوکانو دایکان ماندووبوونو خزمەتەکانتان بەرز دەنرخێنین، بۆ هەمیشە شانازی دەکەین کە زۆربەی تەمەنتان بەخشی بە پەروەردەکردنی ئێمە، بەڵام کە هاتین بۆ ئەم ژیانە زەردەخەنەو پێکەنینو گخەو بڤەمان دەبەخشی، درۆو ڕقو قینمان نەدەزانی، نەماندەزانی ڕەوشتو وشەی ناپەسەند چ واتایەکی هەیە، بۆیە هاوڕێکانم ئەو چەند دێڕەی دواتر دەبێتە میوانی چاوەکانی ئێوەی ئازیز دەردە دڵو ڕاستی ژیانی ناخی خوێندکارێکم بوو کە دەریایەك بوو لە ڕەوشت، زیرەکیو

کەسێتی بەرزو سەرکەوتوو، سەرەڕای ئەوەی مامۆستاو خوێندکاربووین لە هەمان کاتیشدا دوو هاوڕێی دڵسۆزو ڕاستەقینەی یەکدی بووین، باوەڕبکەن ئازارەکانی ئەوەندە کاریگەربوون بە گونجاوم زانی ڕاستییەکانی ژیانی خوێندکارەکەم بگێڕمەوە کە هەمیشە تا مردن لەگەڵ ئەو وشانەدا شەوو ڕۆژ دەگوزەرێنێت، بەو هیوایەی بۆ هەموو باوکە بەڕێزەکانو ئەوانەی چاوەڕوانن ببنە هەڵگری وشەی باوک، ببێتە سوودمەندبوون.

بابەگیان، حەزم دەکرد پێش ئەوەی هەواڵم ببیستن هەواڵم لای تۆ بووایە، هەموو کات حەزم دەکرد لەگەڵ ئاوابوونی خۆرو شەکەتی جەستەو عەلاگەی پڕ خواردن، بزەیەکی لێوانت بە من ببەخشیایە.

بابەگیان، حەزم دەکرد لە بری شەوچەرەی شەوانو خوانی ڕازاوە بە جۆرەها خواردن، بە گیان گیانی تۆ تێر بوومایە، جوانترین تابلۆی خێزانت بنیات بنایە، تا منیش بۆ ئەبەد لە پێشانگای دڵمدا هەڵم بگرتیتایە.

بابەگیان، حەزم دەکرد نێوانمان، وەك دووری نێوان باکورو باشور نەبووایە، هەموو کات وەك شەپۆلەکانی دەریا دەست لە ملان بووینایەو بۆ ساتێکیش لێت دوور نەبوومایە.

بابەگیان، حەزم دەکرد بەبێ ترسو تۆقان، ڕێزم بگرتیتایەو هاوڕێت بوومایە، لە بری شەرمو ڕاکردن لێت، خۆشم بویستیتایە.

بابەگیان، حەزم دەکرد وەك هاوڕێکانم بوومایە، کە هاوڕێبوون لەگەڵ باوکیان، نەك وەك پاشاو گەدا بووینایە.

بابەگیان، حەزم دەکرد لە کۆبوونەوەی باوکاندا هاوشانی باوکانی هاوڕێکانم بوویتایە، نەك کورسییەکەی تۆ لە هەموو کۆبوونەوەکان بێناز خۆی نمایش بکردایە.

بابەگیان، حەزم دەکرد بە هەناسەو یەکە بە یەکەی ترپەی دڵم ئاشنابوویتایە، نەك بە گۆڕانی هەناسەو ترپەکانی دڵم ڕەوانەی لای پزیشکت بکردمایە.

بابەگیان، حەزم دەکرد لەناو دڵمدا بوویتایە، لەگەڵ نارەحەتییەکانی ژیانمدا هاوژیانم بوویتایە، خامۆشکارو ڕەوێنەری خەمەکانم بوویتایە.

بابەگیان، حەزم دەکرد ڕۆژێك لە دەرگای خەمەکانمت بدایە، نەك خەمو ئازارو ئاریشەکانت بۆ زیادبکردایە.

بابەگیان، حەزم دەکرد نێوانی منو تۆ بێ پەردەبووایە، نەك نێوانمان پانتایی ئەرزو ئاسمان بووایە.

بابەگیان، حەزم دەکرد تۆوی گوڵت لە ناخمدا بچاندایە، بۆئەوەی ئێستا گوڵی خۆشەویستی گەشەی بکردایە.

بابەگیان، حەزم دەکرد لەگەڵ بەخشینی شیرینی بەرات بە منالان، شیرینی خۆشەویستیو لێبووردەییو سۆزت بە منالەکانیشت ببەخشیایە.

بابەگیان، حەزم دەکرد بۆ تەنها جارێك لە ڕێگەی خوێندنگا، یان زانکۆ، وەك هاوڕێ دەست لەسەرشان بووینایەو بە ئاڵوگۆڕکردنی وشەی جوان کۆتاییمان بە وشە ناحەزەکان بێنایە، نەك هەتا ئەم ساتەش ڕێگەی خوێندنگا، یان زانکۆی منت نەزانیایە.

بابەگیان، حەزم دەکرد لە ڕێگەدا ڕۆڵەکەت بەدی بکردایە، وەك بێگانەیەك سڵاوت لێ نەکردایە، دەستت بگوشیمایەو ئەم لاو لات ماچ بکردمایە، بۆنی بەرگەکانت بەرگی منیشی بگرتایە، خۆڵو تۆزی جلی کارت، جلو بەرگی منی داپۆشیایە، تا هەستم بە ماندووبوونی تۆ بکردایە.

بابەگیان، حەزم دەکرد بەرهەمی کارەکانت لەسەر مێزی قومار خەرج نەکردایە، لە پێناوی منالەکانتدا سەرفت بکردایە.

بابەگیان، حەزم دەکرد بە دووکەڵی جگەرەکانت ماڵەکەت تاریك نەکردایە، بەڵکو بە یادی خوداو ڕۆڵەگیان ماڵەکەت پڕبکردایە.

بابەگیان، حەزم دەکرد ڕابەرم بوویتایە تا بە وشەو ئامۆژگارییەکانت ڕێگەی ڕاستی ژیانت ئاراستە بکردمایە.

بابەگیان، حەزم دەکرد لە ئاهەنگی دەرچوونی زانکۆو هاوسەریمدا، یەکەم کەس بوویتایە، ئەوەندە خۆشم بویستیتایە لە تۆ خۆشەویستترم بەدی نەکردایە.

بابەگیان، حەزم دەکرد لەگەڵ وشەی باوك، وەك شیرینو فەرهاد بوومایە، نەك بە بیستنی لە دەستی هەڵبهاتمایە.

بابەگیان، لە کۆتاییدا لێم ببورە بۆ وشە زبرەکانم، بۆ ساتێکیش ناتوانم لە ڕووی تۆدا بیدرکێنم، چونکە تۆ ئەوەندە بەرزیت وەك من نیت، ناوەکەت لە هەموو ماڵو کوچەو کۆڵانێکدا هەر بابە گیانی، ئێمە ئەگەر پاشای ئەم جیهانەش بین، هەر ڕۆڵەی تۆینو تۆش هەر بابە گیانی.

# پەیامێك بۆ تۆ

سروش ڕەسوڵ

- هەرکاتێك کە بێخەمو کێشە ژیانت بەسەر برد، ئەوا بزانە کە لەو دیوو ماڵەکەتەوە هەزارێك هەیە لە کێشەدایەو خەمی ژەمە نانی ئێوارەیەتی.
- هەرکاتێك لە ماڵێکی تەواو خانوویەکی خۆشدا ژیانو گوزەرانت بەسەربرد، ئەوا بزانە ڕەشەبایەك هەیە لە شوشەی پەنجەرە شکاوەکانی ماڵێك دەداتو خۆشیو ئاسوودەیی ژیانیانی بردووە.
- هەرکاتێك دڵت خۆشبوو، لە خۆشیدا بوویتو ئاسودەبوویت، ئەوا بزانە کە کەسێك هەیە لە ناخۆشترین ساتەوەختەکانی ژیاندا دەژی.
- هەرکاتێك کە پێداویستیو کەلوپەلێکی گرانبەهاو بە نرخت کڕی، ئەوا بزانە کەسانێك هەیە لە دەست گیرفانی بەتاڵو خاڵییەکەی دەناڵێنێت.
- هەرکاتێك تۆ لەشساغو تەندروست بوویت، ئەوا بزانە کەسانێك هەیە نەخۆشو پەککەوتەو بێ هاودەمو غەریبن.
- هەرکاتێك گەنجێك بوویت لەسەر مۆدێلو بە ئارەزووی خۆت ژیانت بە ڕێکرد، بزانە لە دوای تۆوە گەنجێکی هەژار هەیەو بە ئارەزووی ژیانیش ناتوانێت بژی، نەك بە ئارەزووی خۆی.
- هەرکاتێك ژیانی دونیات زۆر خۆشویستو زۆر پەیوەست بوویت پێیەوە، ئەوابزانە مردنێك هەیە ساتەوەختێك دەتنێرێتە ئەو دیوو دونیا.
- هەرکاتێك کە مردنت بیرچووەوە، ئەوا بزانە کە بەدیهێنەرێکی گەورە هەیەو خاوەنی زەویو ئاسمانەکانەو گەردوونی درووستکردووەو تۆی هێناوەتە بوونو ڕۆحێکی پێبەخشیوەو ڕۆژێك ئەو ڕۆحەت لێدەسەنێتەوە!
- هەرکاتێك هەستت بە هەریەکە لەم شتانە کرد، ئەوا پێویستە لەسەرت، سوپاسگوزاری خودای گەورە بیتو درك بە نازو نیعمەتەکانی و هەست بە مەزنیو بەخشندەیی پەروەردگار بکەیت.

و: ڕاز هەڵەبجەیی



# یادگارییە دووبارەکان

ئەو کاتەی تەمەنم تەنها حەڤدە ساڵان بوو، براکەشم دە ساڵان بوو، ئەگەر کەسێك لە بارەی زەماوەندەوە پێشنیاری بە باوکم بدایە، ئەو تەنها پێدەکەنی، پێکەنینێك کە من بەو جۆرە لێکم دەدایەوە کە ئەو گاڵتەی بەو جۆرە مەسەلانە دێت، بەڵام کاتێکی زۆر تێنەپەڕی کە من پێکەنینەکەی باوکمم بەجۆرێکی تر لێکدایەوە، لەو بەیتە شیعرە تێگەیشتم کە: (خەندەی تاڵی من، لە گریان خەم هێنەر ترە) بەڵێ لەو ساڵانەدا من کچێکی زمان لووسو لە خۆبایی بووم، ئەویش لەبەر دوو هۆ: یەکەمیان ئەوەی کە دایکمم لە دەست دابوو، بێئەوەی هەست بکەم خۆشەویستی دایکمم لە میهرەبانییە لە ڕادەبەدەرەکەی باوکمدا دەدۆزییەوە..

دووەمیان: دەگەڕایەوە بۆ جوانی ڕووخسارم کە دیارییەك بوو خوای گەورە پێی بەخشیبووم، چونکە هەمیشە لە لایەن دەوروبەرو خزمانو دراوسێکانو هاوڕێیانو هاوپۆلەکانمەوە بە جوان باس دەکرام، بە داخەوە دووچاری جۆرێك لەخۆبایی بوون ببووم، وام بیردەکردەوە هەرچییەکم بووێت دەبێت ئەنجام بدرێت، لەوانەیە هەر لەبەرئەمەش بووبێت کە باوکی بێچارەم دوای ئەو ڕووداوانەی کە لە سیانزە ساڵیمدا ڕوویدا، تەنانەت نەی دەوێرا بیر لە زەماوەند بکاتەوە، ڕووداوەکە بەو جۆرەبوو کە چوارساڵ لە مەوپێش پورەکانم کە زۆر باوکمیان خۆشدەویست، گەیشتنە ئەو ئەنجامەی کە بە تێپەڕبوونی چەندساڵێك بەسەر مردنی دایکمداو ئەوەی کە براکەیان وردە وردە لە پیری نزیك دەبێتەوە کاتی ئەوە هاتووە کە دووبارە ژن بێنێتەوە، کە هەم بە منو هەم بە برا بچووکەکەشمدا ڕابگاتو ئەویش لە تەنهایی ڕزگاری بێت، بەڵام من کاتێك کە زانیم خەریکە بابەتەکە دەبێتە ڕاستی نمایشێکم سازکرد تا سەرنجی باوکم بە جۆرێك ڕابکێشم کە بۆ هەمیشە ژنهێنان لە مێشکی دەربکات، ڕاکردن لە ماڵ، ئەویش لە بەیانی تا شەوو بەجێهێشتنی یاداشتێك بۆ باوکم کە تیایدا نوسیبووم کە زەماوەندی باوکم هۆکاری ڕاکردنەکەمە، بە جۆرێك کاریگەری لەسەر باوکم دروستکردبوو کە دوای گەڕانەوەم بۆ ماڵەوە باوکم بۆ هەمیشە ژنهێنانی لە مێشکی دەرکرد، بیرم چوو ئەوە بڵێم کە ئەو ڕۆژە لە ڕاستیدا ڕام نەکرد، بەڵکو نزیکەی دە کاتژمێر لە هەورەبانەکەدا خۆم شاردبووەوە، تا تەنها باوکمو پورەکانم بترسێنم، من ئەم ڕازەم هەرگیز بە هیچ کەس نەوت، بەڵام هەمووییم لە دەفتەری یادگارییەکانمدا کە لە نۆ ساڵییەوە تەواوی ڕووداوە گرنگەکانی ژیانمم تێدا نوسیبو.

هۆکاری ڕازی نەبوونەکەشم ئەو بیرکردنەوە خراپانەبوو کە بەرامبەر بە باوەژن هەمبوو، کە دەوترا باوەژن خراپەو... تەنانەت ئەگەر ئەوەی باوکم لە باشەکانیش بووایە هەر دەبووە هۆی ئەوەی کە باوکم ئیتر خۆشەویستی خۆیم بۆ دەرنەبڕێت.

بەوجۆرەبوو کە ئەو نەخشە منداڵانە، بەڵام سەرکەوتووانەیەم جێبەجێکردو لە کۆتاییدا بوومە هۆکاری ئەوەی کە باوکم زەماوەند نەکات، بەڵام.. دوای چوار ساڵ کە خەریك بووم دیبلۆمم وەردەگرت، یەك کاتژمێر دانیشتنم لە ماڵی خانمی فەهیمی کە یەکێکبوو لە مامۆستاکانم کە بۆ شیکارکردنی پرسیارێك چووبوومە لای، بووەهۆی ئەوەی کە ئایندەی باوکم ببینم.

لە ماڵی خانمی فەهیمی کە لە ساڵی یەکەمی ئامادەییەوە مامۆستام بوو، زۆر هاوڕێ بووین پێکەوە، پیرە پیاوێکم بینی کە لە گۆشەیەکی ژوورەکەدا لەسەر قەنەفەیەك دانیشتبوو، تەواو لاوازوو بێتاقەتو خەمۆك بوو، کاتێك هۆکارەکەیم لە خانمی فەهیمی پرسی، ئاهێکی هەڵکێشاو وتی: (ساڵانێك لەمەوپێش کە منو سێ خوشكو براکەم هێشتا لەسەر ماڵ بووین، باوکم دوای مردنی دایکمان بڕیاریدا ژن بێنێت، بەڵام ئێمە هەرچوارمان بەهەر شێوازوو ڕێگایەك بوو نەمان هێشت ژن بێنێتو باوکیشم تەنها لەبەرخاتری ئێمە ژنی نەهێنا، دوای چەند ساڵێك کە ئێمە دانە دانە زەماوەندمان کردو ماڵمان پێکەوەنا، باوکمان بە تەنها مایەوە، تەمەنیشی ئەوەندە گەورەبووبوو کە ئیتر نەیدەتوانی ژن بهێنێت، لەبەرئەوە تەواوی ساڵ لە ماڵەکەیدا بە تەنهایە هەرجارەو من، یان براو خوشکەکانم، دەیبەینە ماڵی خۆمان تا خەفەت نەخوات، بەڵام ڕاستییەکە ئەوەیە کە ئێمە ستەممان لەو کرد، ئێستاش کە ئەوە دەزانین جگە لە سزای ویژدانو خەفەت خواردن هیچمان پێناکرێت...)!

ئەو ڕۆژە خۆمم لە قاڵبی کەسایەتی مامۆستاکەمدا بینی، ئەوەندە ڕقم لە خۆم بوو کە مانگێك دواتر دوای کۆتایی هاتنی تاقیکردنەوەکانی ساڵی کۆتاییم، ئەمجارە خۆم دەست بەکاربوومو ڕۆیشتم بۆ لای پورەکانم تا ڕێگری لە ئایندەی تاڵی باوکم لە داهاتوودا بکەم.

دۆزینەوەی ژنێك کە لەگەڵ تەمەنو ژیانی باوکمدا گونجاوبێت زۆر قورس نەبوو، بەڵام باوکم زۆر ڕاڕابوو، تا ئەوەی کە سەرەنجام (نوشین) کە یەکێك لە هاوڕێکانی سەردەمی خوێندکاری پورە بچووکەکەم بوو، لەگەڵ باوکیشمدا یەکتریان دەناسی، بە گونجاو زانیو هاتوچۆکان دەستی پێکرد، کێشەی یەکەمو گرنگتر لە هەمووی ڕازیکردنی نوشین بوو، هەڵبەتە ئەو هیچ کێشەیەکی لەگەڵ باوکمدا نەبوو، چونکە لە ئارامیو ڕاستگۆیی باوکم ئاگادار بوو، بەڵام نیگەرانی ئەو ژنە سیو

حـەوت سـاڵەیە کە بـە هـۆی گیرۆدەبوونی مێردەکەی بە مادەهۆشـبەرەکانەوە سـاڵانێك بوو لێـی جیا ببووەوە، مـنو براکەم بووین، بـەڵام خۆشـبەختانە بە هـاوکاری پورەکانم چارەسـەر کرا،بەشێوەیەك لانی کەم من وەکو هاوڕێ ڕەفتار لەگەڵ ئەودا بکەم، ئیدی توانیم هاوسـەری ئایندەی باوکـم بێ خـەم بکەم، دڵنیاشـبووم لەوەی کاوەی براشم پێشوازی لێ دەکات، چونکـە من هەرچییەکم بووتایە کاوە قبوڵی دەکردو پێی ڕازی دەبوو... بەڵام کەمێك هەڵەم کرد!

هەمـوو کارەکان ئەنجامـدرانو بـە پێی بەرنامەکانی پورم کە بە تەواوەتی دەرهێنەری ئەمجۆرە مەراسـیمە خێزانیانەبوو، بڕیاربوو کاتژمێر پێنجی دوای نیوەڕۆی پێنج شـەممە نوشـین لە باوکم مارە بکرێـتو میوانییەکی بچووك بەڕێوەبەرینو...تەواو! بەڵام سـەر لە بەیانـی ئـەو ڕۆژە نزیکی کاتژمێـر نۆ بوو، کاتێك جلەکانم لە ئوتو هێنایەوەو گەیشـتمە ماڵـەوە، یاداشـتێکم بە دەسـتو خەتی کاوە بینی: (ئێسـتا کە باوکم دەیەوێت ژن بێنێت، من لێرە دەڕۆم تا ئەو ئازاد بێت).

بۆ چەنـد خولەکێـك خـەمو نیگەرانی خەریکبـوو لە هۆش خۆمـم بەرێت، لە ناکاو شتێکم بە مێشـکدا هات، (هەستەکەم هەموو شتێك دووبارەیە)، بەڵێ هەر دەتگوت فیلمێکی دووبارە دەبینم! کـە باش بیرم کردەوە بیرم هاتـەوە: (منیش ئەو ڕۆژەی کە لە ماڵەوە ڕام کرد یاداشتەکەم بە ئاوێنەکەوە نووساند.. ئەو کاغەزەی کە لەسەری نوسیبووم هەر وەکو ئەو یاداشتەی براکەم پارچەی یەکێك لە وێنەکانی دایکی خوالێخۆشبووم بوو، کاوەش هەمان شتی کردبوو، تەنانەت هەر ئەو وشانەشی کردبووە ڕستە کە من بەکارم هێنابوو لە یاداشتەکەمدا.. دواتر لە پڕ بیرم هاتەوە کە براکەم هەمیشـە بەهـۆی فزولییـەوە حەزی دەکـرد دەفتەری یادگارییەکـەی مـن بخوێنێتـەوە... هەر بەو هۆیەوە دۆزینەوەی کاوە پێویسـتی بە گەڕانی زۆر نەبوو.

کاتێـك کـە لـە هەورەبانەکـەدا کاوەم دۆزییـەوە ئـەو (هەربـەو شـێوەیەی کە لە دەفتەرەکـەدا نوسـیبووم)، کەمێـك میـوەو نـانو ئـاوی لەگەڵ خۆی بردبوو، تا برسـیو تینووی نەبێت! کاوە لە سـەرەتادا بە بینینی مـن زۆر خەجاڵەت بـوو، بەڵام من بە گاڵتەو پێکەنینەوە وتم: (تەنها خۆزگە کۆتا لاپەڕەی یادگاریەکانیشمت بخوێندایەتەوە).

پاشـان بابەتـی باوکی خانمـی فەهیمیم بەوشـێوەیە بۆ کاوە باسـکرد، کـە کاریگەری لەسەر بەجێ بهێڵێت.

سوپاس بۆ خوا هەرچەندە نوشین هیچ کات ناتوانێـت جێگای دایکمان بۆ پڕ بکاتەوە، بەڵام ئەوەندەی دایکمان میهرەبانە بۆمانو باوکیشـم زۆر لێی ڕازییە. سەرچاوە/ روزها زندگی.



ن: د. ماجد حیدر
و: ئیبراهیم بەهادین

# گەشتیاری ڕاستەقینە

زۆر حەز لە گەشـتو سەیران دەکەم. بۆیـە هەر کاتێـك بزانم خزمێـك، یان هاوڕێیەکـم لـە سـەفەر گەڕاوەتـەوە، یەکسەر بانگهێشـتی دەکەم بۆ لای خۆمو بە لێشـاو پرسیاری ئاڕاسـتە دەکەم. بە جۆرێـك پرسـیارەکان ڕێکدەخـەم کـە زۆرترین زانیاریم سـەبارەت بە شوێنەکە دەستبکەوێت.

لـە کاتـی گوێگرتن دەمم هەمیشـە کراوەیە لە سەرسام بوونم بە وەڵامەکان، هەرچەندە زانیارییەکانیش دووبارەبن!

زیاتر لە بیسـت ئەلبوومی تایبەتیم هەیە، تایبەت بە شـوێنە گەشتیارییەکان لە هەموو کیشوەرەکان. جگە لە چەندین فەرهەنگـی جوگرافـی قۆناغەکانـی قوتابخانـەو زانکـۆو هەندێکـی تـری تایبەتمەند.

دوای ئـەوەی پـارەی کۆمپیوتەرێکم کۆکـردەوە، یەکەم (دیسـك) کـە کڕیم بریتـی بوو لـە فەرهەنگـی جوگرافیای جیهانی.

من هەموو شـوێنێکی وێسـتگەکانی جیهـان شـارەزام لەسـەر ڕادیۆ. پوولی دارایـی هەمـوو وڵاتێکی جیهانـم هەیە، تەنانەت ئەو وڵاتانەی کە هیچ کەس ناوی نەبیسـتوون. هەروەها ئامادەم پێشبڕکێی زانیاری ساز بدەم لەگەڵ کەسێك چەندین ساڵ ژیابێت لە شـاری لەندەن، سەبارەت بە ناوی شـەقامەکانو شـوێنی وەزارەتو ڕێگاو مۆزەخانە. هەروەها ژمارەی گشت ئەو پاسـانە دەزانم کە بـە نزیکی (برج ئیفل)و مۆزەخانـەی لۆڤەر دا تێدەپەڕن لە پاریـس. دەزانـم نرخـی هەمبەرگر چەنـدە لە دیترۆیت. جگـە لە ژمارەی نهۆمەکانی باڵەخانەی شـارەوانی لە سان سیباستیان!

بەڵـێ، گەشـتکردن خولیـای منـە، سەیران، تاکەخۆشەویستمە، گەڕان، ئارامی بەخشی ژیانمە.

بۆیـە زۆر دڵتەنـگ بـووم، کاتێـك پەرداخە ئاوەکە ڕژایە سەر پاسپۆرتەکەم، کە هەمیشـە لەسـەر مێزەکەی تەنیشتم دایدەنێـم. هەرچەندە تەنیـا بەرگەکەی تێکچووبوو، بەڵام نیگەران بووم، بە تایبەت کە ناچاربووم چاکردنەوەی پاسپۆرتەکەم دوابخـەم بۆ ڕۆژی دواتر، تـا ئەو کاتەی براکەم دێت بۆ سـەردانم، بۆئەوەی جلو بەرگم بگۆڕێتو پێداویستییەکانی ترم بۆ جێبەجێ بکات.

بەڕاست، بیرم چوو پێتان بڵێم: کە من (٣٠) ساڵە لەم ژووورە نەچوومەتە دەرەوە، لەبەرئـەوەی من، هەر لە سـەرەتاوە بە پەککەوتەیی لـە دایکبوومو ئەندامەکانی جەستەم جووڵەیان تێدا نییە.



# قەیرانی فێرکردن لە ئەمریکا!

ئا: ئەمیر ئەحمەد عەبدولقادر

بێگومان گرنگی فێرکردن مەسەلەیەکە ئەمڕۆ لە سەرجەم ناوچەکانی ئەم جیهانەدا جێگەی مشتو مڕە، ئەزموونە نێودەوڵەتییە هاوچەرخەکان سەلماندوویانەو هیچ بوارێکیان بۆ گومانبردن نەهێشتۆتەوە کە سەرەتای پێشکەوتنی ڕاستەقینە، بریتییە لە فێرکردن.

هەموو ئەو وڵاتانەی قۆناغێکی گەورەیان بڕیوە لە پێشکەوتن، ئەوا لە دەروازەی فێرکردنەوە بەرەوپێشچوون، بەڵکو وڵاتە پێشکەوتووەکان فێرکردن لەسەرووی بەرنامەو سیاسەتەکانیانەوە دادەنێنن. شتێکی سروشتییە کە ئەو گۆڕانکاریو ئاڵوگۆڕانەی لە جیهاندا ڕوودەدەن، ڕەنگدانەوەی ڕاستەوخۆیان لەسەر پرۆسەی فێرکردن هەیە لەسەرجەم ناوچەکانی جیهاندا، چونکە بە سیستمێکی کۆمەڵایەتی دادەنرێت لە چوارچێوەی سیستمی گشتگیری کۆمەڵگەدا.

ئێستا کە جیهان بە قۆناغێکی زۆرهەستیاردا تێدەپەڕێتو لە سەدەیەکەوە بۆ سەدەیەکی ترو لە ڕژێمێکی سیاسییەوە بۆ یەکێکی ترو لە سیستمێکی ئابوورییەوە بۆ سیستمێکی تری زۆرجیاواز، بێگومان ئەو کاتە بەسەرچووە، هەر وڵاتێك لە ناو سنووری خۆیدا بسوڕێتەوەو لە جیهان گۆشەگیربێت، چونکە شۆڕشی ئەمڕۆی گەیاندنەکان، هەموو بەربەستێکی کاتو شوێنی تێپەڕاندووە.

جیهان بەم گۆڕانکارییانەو شتی دیکەش بە ئاڕاستەی سیستمێکی نوێی جیهانیدا دەڕوات، کە سرووشتی ژیان بە تەواوی دەگۆڕێتو وای لێهاتووە لە شارستانییەتی شۆڕشی سێییەمدا دەژی، کە گۆڕنکارییەکان بە خێرایی ڕوودەدەن، هەروەها چەشنێکی نوێ لە تەکنەلۆژیای پێشکەوتوو سەپێنراوە کە پێویستی بە جۆرێکی دیاریکراوی کرێکاری هەیە، کە توانای گۆڕینی پیشەیی هەبێت لە پیشەیەکەوە بۆ یەکێکی تر، لە چوارچێوەی فێرکردنێکی بەردەوام.

ئەوەی پاڵی نا بە وڵاتە پێشکەوتووە تازە گەشەسەندووەکانەوە وەکو یەك، بۆ خۆئامادەکردن بۆ توێژینەوەو پێشبینیکردنی گۆڕانکارییەکان، لە ئێستاو ئایندەداو ئەو چاکسازییە پیشەییو گشتگیرانەی پێویستن بە ئامانجی ئامادەکردنی هاوڵاتیانیان بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی ئەو گۆڕانکارییانەو هاوشان ڕۆیشتن لەگەڵ شۆڕشی تەکنەلۆژیاو زانیارییەکان.

ئەگەر سەیری وڵاتە مەزنەکان بکەین کە ململانێ لەسەر لوتکە دەکەن، دەبینین لە سیستمی فێرکردنو پەروەردەدا زۆر پێشکەوتوونو هەوڵیش دەدەن سیستمی فێرکردنی وڵاتانی ڕکابەر تاوتوێ بکەن، باشترین نموونەش لەسەر ئەوە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکاو ژاپۆنە.

بۆ بەڵگە هێنانەوەی ئەوەش وڵاتەکەی (مستەر بنبیت)ی وەزیری پێشووی فێرکردن لە ویلایەتەیەکگرتووەکانی ئەمریکا بەسەرکەوتوویەتی (فێرکردن لە ژاپۆن سەرکەوتنێکی گەورەی بەدەستهێناوە بۆ بەهێز کردنی ئابووری وڵات، کە دەتوانێت کێبەرکێیەکی توند بکات لە بازاڕەکانی ئابووری جیهاندا، لەبەرئەوە شتی باشی بۆ ئێمە مسۆگەر کردووە کە ئێمە گەلێکی واقیعیو پراکتیکین، ئەوەی لە تواناداییە فێری ببین لە سیستمی فێرکردن لە ژاپۆن.

ئەمەو سەرەڕای ئاڵۆزی زمانی ژاپۆنو ویلایەتەیەکگرتووەکانی ئەمریکا، چەندین نێردراوی پەروەردەییو فێرکردن ڕەوانەی ژاپۆن کردووە، تاکو بە چاوی خۆیان ببینن ژاپۆنییەکان چۆن فێردەبن، هەروەها شێوازەکانی فێرکردنی ئەوان بناسن.

لەگەڵ دەرکەوتنی ژاپۆنو هەستکردنی ئەمریکییەکان بەوە کە (یەنی) ژاپۆن زاڵبووە بەسەر بازاڕەکانی جیهاندا، بە ئاشکرا ڕاپۆرتێکیان دەرکرد کە دەڵێت: بەشێوەیەکی گشتی گەل لە مەترسیدایە، سیستمی فێرکردن نوێ دەکرێتەوە بەتایبەتیش قۆناغی بنەڕەتیو پێشخستنی زانستەکانو بیرکاری، ئەمەش لەسەردەمی سەرۆك ڕیگان بوو، لە پاشان (بۆش) درێژەی دا بە بایەخدان بە فێرکردنو بەرنامەی گرنگی فێرکردنی بۆ قوتابیان ڕوون دەکردەوە لە پێناو مانەوەی ئەمریکا، هەروەها کلنتۆن بە هەمان شێواز بەردەوام بوو لەسەر بەرنامەکانی پێش خۆیو دووپاتی کردەوە کە فێرکردن ڕەهەندێکی بنچینەییە بۆ ئاسایشی نەتەوەیی ئەمریکا.

لە ساڵی ڕابردوودا ٢٠٠٠ ستراتیژیەتی فێرکردن بڵاوکرایەوە، لە ساڵی ٢٠٠١ تاکو ساڵی ٢٠٠٥ز کە لە سەرەتایەکەیدا دووپات کراوەتەوە لەسەر ڕۆڵی فێرکردن لە پێکهێنانی دەوڵەتی بەهێزو ئەم ستراتیژییەتە لە چوار تەوەری سەرەکی پێکدێن کە ئەمانەن:

ئامانجی یەکەم: فێرکردنی قۆناغی بنەڕەتی هەموو تاکێك بگرێتەوە.

ئامانجی دووەم: پێشخستنی چاکسازی سیستمی فێرکردنی ئەمریکی، بەشێوەیەکی گشتی.

ئامانجی سێیەم: بەدیهێنانی هاوسەنگی دەرفەتەکان لە قۆناغی ئامادەییو دواتریش.

ئامانجی چوارەم: بەرەوپێشبردنی وەزارەتی فێرکردن، بەشێوەیەك لەگەڵ ئامانجەکانی پێشوودا بگونجێت.

سەرەڕای ئەوانەش سەرنجمان دا، لە بانگەشەکانی هەڵبژاردندا لە نێوان (بۆشی کوڕو ئال گۆر) تەوەرەی فێرکردن بایەخی زۆری هەبوو، کاتێك جۆرج Wبۆش هاتە سەرتەخت، بەڵێنەکانی جێبەجێکردو ڕاپۆرتێکی بڵاوکردەوە بە ناوی:

(no child Left Behind) هیچ منداڵێك بە لاوە نانرێتو تیایدا هاتووە ڕۆڵی حکومەتی فیدراڵی لە فێرکردن، تەنها لە خزمەتکردنی ڕژێمدا نییە، بەڵکو خزمەت بە منداڵەکانمان دەکات، سەرەڕای وتەکانی ئێمە دوو جۆر نەخوێندەوارمان هەیە، یەکێکیان دەخوێنێتەوەو خەون دەبینێتو ئەوی تریان ناخوێنێتەوەو ئایندەی لەبەرچاو نییە.

لێرەوە بۆمان دەردەکەوێت کە فێرکردن جێگای بایەخ پێدانی سیاسەتمەدارانی ئەمریکایە، ئەوەش لەو ڕوانگەیەوە کە فێرکردن، وەکو چەکێکی یەکلایی کەرەوەیە بۆ گۆڕینی واقیعو ڕووبەڕوو بوونەوەی دواڕۆژ، لێرەدا ئامانج ئەوە نییە بەراورد بکەین لە نێوان فێرکردن لە ئەمریکاو سیستمەکانی فێرکردن لە جیهانی عەرەبی، بەڵکو تاڕادەیەك ڕوونکردنەوەی ڕووکارو گرنگترین خاسییەتەکانی ئەو سیستمانەیە بۆ تێڕوانین کە چۆن ئەو وڵاتانە خۆیان ئامادە دەکەن بۆ مامەڵەکردن لەگەڵ ئێستاو ڕووبەڕووبوونەوەی ئایندە لە ڕێگای سازدانی مرۆڤی بە توانا لەسەر مامەڵە کردن لەگەڵ تازە داهێنراوەکانی سەردەمو تەکنەلۆژیای نوێ، بەبێ ئەمانە هەمووی هیچ شتێك لە بەردەممان نامێنێت، جگە لە توانەوەو لەناوچوون.

# گفتوگۆو ڕاگۆڕینەوە

## هەوێنی پێکەوە بوونو بەردەوامبوونی ژیانی هاوسەرییە!

پێکەرد فارس



زۆرێـك لـە هاوسـەران سـكاڵای بێدەنگـیو دووره پەرێـزی گفتوگـۆی هاوبەشـی ژیانیـان دەكـەن، لـە هەمان كاتیشـدا خۆشـیان دەستپێشـخەری دروسـتكردنی كەشـێك نین بۆ گفتووگۆو قسەكردن لەسەر كێشەو ئەو بارودۆخانەی كە چەندین پرسیاری بێ وەڵامیان كەڵەكە كردووه لە ژیانی هاوسەرێتیدا!

دەڵێـن «كورتتریـن ڕێـگای جیابوونـەوه بریتییە لـە بێدەنگی نێوان هاوسەران» بۆئەوەی تۆ هۆكاری ئەو ڕێگە سـەختە نەبیت، پێویستە دەستپێشخەری بكەیت لە دروسـتكردنی ئەو گفتوگۆیەی كـە زیاتـر نزیكتان دەكاتەوه لـە یەكتر، نەك دووركەوتنەوه.

زۆرجـار ئافرەتان باس لەوه دەكەن بوونەتـە ئامێرێـكو دەرئەنجامی هەموو كارەكان بـۆ ئـەوان دەگێڕدرێتەوه، ئەمە بـە هەڵـە پێناسـە كـراوەو وەرگیـراوه بـەو مانایەی كـە پێویسـتە هەموو كات ئافـرەت واز لـە مـافو پێویسـتییەكانی بهێنێت، چونكە قسـە هەر قسـەی پیاوه! بـەڵام من ئەوه بە ڕاسـت دانانێم، بەڵكو دەیگەڕێنمـەوه بۆ سروشـتی ئافرەت كە هەمیشـە بە ڕۆحی فراوانو لێبڕاوانە بۆ كەمكردنەوەی كێشـەكان بێدەنگی قبووڵ دەكات، ئەمـەش ئـەوه ناگەیەنێت پیاوان خاوەنی كێشەكان بن، بەڵام بە شێوەیەكی گشـتی ئەمە لە ئافرەتاندا بەدی دەكرێت، ئەویش لەبەر چەنـد هۆكارێك ئەوانیش «منداڵ، كەسوكار، كۆمەڵگە»..

ئـەوەی ئێمە مەبەسـتمانە لێرەدا، ئەوەیـە ئافرەتان ڕابهێنین لەسـەر چەند هەنگاوێـك بـۆ دروسـتكردنی كەشـێك بـۆ گفتوگـۆ، چونكە بەڕاسـتی نەبوونی گفتوگۆو ڕاگۆڕینـەوه، یاخود دیاریكردنی ڕەفتاری باشو ناباشـی یەكدیو پاراستنی ڕێـزو خۆشەویسـتی، سـەرەڕای بوونـی جیاوازییـەكان، بێگومان ئەمـە خۆی لە خۆیـدا، هەنگاوێكـە بـۆ دروسـتكردنی كەلێنێكی گەوره لە ناو خێزانداو پاشانیش جیابوونـەوه، یان نەمانی هیچ هەسـتو سۆزی خۆشەویسـتی نێوانیان. كەواتە تۆ دەستپێشخەربەو بەم هەنگاوانەش دەرگای گفتوگۆ بكەرەوه:

یەكەم: **لـە چۆنێتـی تێپەڕبوونی ئەمـڕۆی بپرسـە**، كاتێك هاوسـەرەكەت دەگەڕێتـەوه، پـاش ئەوەی بـە ڕوویەكی خۆشـەوه پێشـوازیت لێكرد، خواردنی بۆ ئامادە بكە بەو شێوەیەی ئەو پێی خۆشەو پاشان لێ بپرسە ئەمڕۆت چۆن بەڕێكرد؟ بـەڵام بە مەرجێك كاتێك قسـەی لەگەڵ دەكەیـت بـا ڕووت لەو بێـتو بە گرنگی پێدانەوه لە نزیكییەوه دابنیشە، سەرقاڵی شتی تر نەبیت ئیتر خوێندنەوه بێت، یان سەیركردنی تەلەفزیۆن.

دووەم: پیـاوان پێیـان خۆشـە ئامـۆژگاری بكـەنو هەسـت بكـەن یارمەتیدەرنو ڕای خۆیان لەسەر هەندێك شـت بڵێن، بۆیە تۆش بـە جۆرێك داوای یارمەتی لێ بكە لەسـەر باسـێك كە لات بووەتە پرسـیارو وەڵامت بۆینییە، تۆ بە نیـازی ئامـۆژگاری پـرسو ڕای پێ بكە، دڵنیابە زۆر خۆشحاڵ دەبێتو بەو شێوەی تۆ دەتەوێت گفتوگۆت لەگەڵدا دەكات.

سێیەم: بێگومان هیچ كەسێك نییە هەڵـە، یـان كەموكورتی نەبێت، شـەوان مەخەوه تا دڵنیا بیت كە ئەو لێت ڕازییە، یـان نا؟ پێی بڵێ كە ئـەو ڕەفتارانەی كە تۆ بێـزار، یان دڵتەنـگ دەكات، ئاگادارت بكاتـەوه، بۆئەوەی هـەوڵ بدەیت چاكیان بكەیت لە پێناو ڕەزامەندی ئەوو ڕاگرتنی كۆڵەكـەی بەختـەوەری هـەردوولا، ئەو كات ئەویـش بەم دەستپێشـخەرییەی تۆ خۆشـحاڵ دەبێتو بە هەمان شێوه هەمان پرسیار لە كەمو كوڕییەكانی خۆی دەكات، ئەمەش خۆی بۆ خۆی گفتووگۆیەكی چڕو پڕ بەرهەم دەخوڵقێنێت.

چوارەم: دەربارەی كەسو كارو ماڵی باوكی پرسیاری لێ بكە، یان خۆت جارجار بەسـەردان بێـت، یاخـود پەیوەندیكردن بێـت، هەواڵیان بپرسـەو پاشـان هەواڵی سـەلامەتیو باشـی ئەوان بەو ڕابگەیەنە، دڵنیابە ئەویش دێتە گۆو ڕازو نیازی خۆی دەڵێتو ئەو كات خۆشەویسـتیو هەستی بەرپرسـیاری دەبێتە بەرنامەیەك تێیداو ئاسوودەییو خۆشگوزەرانی دەبێتە میوانی ماڵەكەتان.

لە كۆتاییدا دەڵێم: خوشـكی ئازیز، هەرگیـز گرنگـی پێدانی هاوسـەرەكەتو دەربڕینی سـۆزو خۆشەویستیت بۆی، بە كەم مەزانـە، دڵنیابە ئەگـەر بۆی ببیتە زەوی، ئەوا بۆت دەبێتە ئاسمان!









# ئەدەبی کوردی ١

پێتان سەیر دەبێت گەر بڵێم: لە کۆلێژەکەی ئێمەدا، وانەیەك کە ببووە مۆتەکەی سەر دڵی زۆرێك لە خوێندکارانو هەمیشە گازندەیان لێدەکردو هەندێك بە زەحمەت نمرەی دەرچوونیان دەهێناو هەندێکیش هەر دەرنەدەچوونو بۆ خولی دووەم دەمانەوە!! وانەی «کوردۆلۆجی» بوو!

هەڵبەت جێگەی سەرسوڕمانەو مافی خۆتانە زۆریشتان پێ سەیر بێت، کە خوێندکار هەبێت ئارەزووی وانەیەك نەکات، کە زمانو ئەدەبو کەلتوورو کەلەپووری خۆی پێ دەناسێنێو زمانو ڕەوانبێژیو بەیانی فێردەکات!

بێگومان بۆ ڕەوینەوەی سەرسوڕمان، هەمووان پێویستە هێمنانە بە وردی لە هۆکارەکانی ئەم کێشەیە سەرنج بدەین، بۆئەوەی بتوانین چارەسەری بۆ دیاری بکەین.

سەرەتا من کێشەکە لەوەدا دەبینم، کە دەبوا لەو ڕۆژەی ڕا منداڵەکانمان زمانیان دەپژا، بە شیعرو هەڵبەستو بەیتو باڵۆرەو داستانو پەندی پێشینان ئاشنامان کردبان، تا زمانێکی پاراوو ڕستەی جوانو دەستەواژەی بەرزو پڕمانا فێربنو بەهەستێکی ناسكو تەبعێکی تەڕو بەیانێکی ڕوونو وتەی شیرینەوە بنووسنو بدوێن!

وێڕای ئەوەی کە شارەزابوون لە ئەدەبو مێژوو و کەلتوورو کەلەپوری مێژووی کورد، ئەرکی سەرشانی یەکە بە یەکەی خوێندەوارانی گەلی کوردە، هەر کەسەو بەپێی توانا، بەڵام خوێندکارانی بەشە ئەدەبیو مرۆییەکان، دەبێت وەك فەرزی عەین تەماشای بکەنو بە کیفایەتی نەزانن!!

وەلێ کاتێك ئەم وانەیە سەرو بن دەکرێو لە بنەڕەتەوە ناوێکی نامۆی لێ دەنرێت، هەر لە دووررا بە گوێ نامۆ دەبێتو دڵی مرۆی لێ دەتۆرێ!

«کوردۆلۆجی»، وەکو «جیۆلۆجی» یا «سایکۆلۆجی»... هتد، دێتە بەر گوێ، زمانێك هێندە دەستەوەستان بێت نەتوانێت ناوێك لە خۆشی بنێ، ئاساییە کە پشتگوێ بخرێ، بەڵام زمانی ئێمە هێندە هەژار نییەو دەکرێت نێو لە خۆی بنێ: «کوردناسی» یا «کوردزانی» یا «زمانو ئەدەبی کوردی» یاخود «مێژوو کەلەپوری کورد»و دەیان ناوی دی!!

ئایا بیستراوە عەرەب بە ڕێزمانی خۆیان بڵێن: «گرامەری عەرەبی»، یا ئینگلیز بە ڕێزمانی خۆیان بڵێن: «قواعد اللغة الانجليزية»؟!

پاشان بۆچی ئەم وانەیە کە تەنها بۆ ڕۆشنبیری گشتییەو دوو کاتژمێرە لە هەفتەیەکدا، بئاخنرێت لە مێژووی میرنشینە کوردەکانو مێژووی کۆنو نوێ وشیعری کرمانجی سەروو، هەندێجار بە زمانی لوڕیش؟!

بۆ نەکرێت بە وانەیەك بۆ شیرینکردنی زمانو ئەدەبی کوردی لای خوێندکارانو ئاشناکردنیان بە زمانی نەتەوەکەیانو هاندانیان بۆ خوێندنەوەو تێگەیشتنو لە بەرکردنی دەقە ئەدەبییەکان......

شارەزابوونیان لە داڕشتن و گوزارشی ئەدەبی و ڕەوانبێژی، زمانێکی پڕ ماریفەت و مانای بەرز.

بەو مەبەستە کە لای من کارێکی زۆر پێویست و پیرۆزە لەم ژمارەیە بەدواوە پێش ماڵاوایی بۆ ئەو کارە تەرخان بکەم، بەو هیوایەی بتوانم منیش مەڵۆیەك بخەمە سەرخەرمانی ڕەنج و ماندووبوونی دڵسۆزان و خۆشەویستانی زمان و ئەدەبی کوردی و بە زیندووکردنەوەو شیرینکردنی لە دڵی لاوان و خوێندەوارانی هاوچەرخدا خزمەتێکی بچووك پێشکەش بکەین بەشێك لە ئەرکی کوردانەمان بەرامبەر زمان و ئەدەب و کەلتووری میللەتەکەمان ئەدا کردبێت، سەرکەوتنیش لە پەروەردگاری باڵادەست بە ئاوات دەخوازین.

شێخانی